ڕەفیق سابیر

# بەرەو مێژوو

## کورتە باسێکی فیکری - مێژوویی

سوید - ١٩٩١

بەرەو مێژوو
رەفیق سابیر
کورتە باسێکی فیکری - مێژوویی
چاپی یەکەم سوید ١٩٩١
پیتچنین و مۆنتاژ: دیلان دەرسیم
چاپخانەی مەنسوور

# ناوەڕۆک

لاپەڕە

### لەجیاتی پێشەکی

# چریکەیەک لە جەنگەڵدا

پێدەچێ مێژوو بە درێژایی هەزاران ساڵ بە پێی لۆژیکێکی دیهەنگانە، بەڵام زاڵمانە بەڕێوە چووبێ. بۆیە زیاتر دوو حاڵەتی سەرەکی دژبە یەک، یان دوو جۆرە دیاردەی ناکۆکی بە خۆ گرتوە:

بۆ ئەوەی مرۆڤ لەگەڵ مێژوودا هەڵبکات دەبوو یان سەردەستەو زۆردار، یان ژێر دەستەو زۆر لێکراو بێ!

تۆ بڵێی ئەو نەتەوە خاوەن شارستانی و کولتوورە بەرزانەی لە ناو چوون (میسرییە کۆنەکان، بابلییەکان، سۆمەرییەکان، مادەکان..هتد) نەمانی خۆیان لەوە پێ باشتر بوو بێ تا کۆیلە و ژێر دەستەی

داگیرکەرە شمشێر وەشێنەکانیان بێ!! یان بە واتایەکی تر لەبەر ئەوە لە ناوچوویین چونکە نەمانتوانیی لەگەڵ ئەم لۆژیکە باوەی مێژوو هەڵکەین؟!.
ئێمە بە درێژایی مێژوو نەتەوەیەکی زۆردار نەبووین... نەتەوەیەکی کۆیلەدار نەبووین... رەنگە لەبەر ئەوە بێ کە بە جۆرێکی ئۆتۆماتیکیانە لە چارەمان نووسرا بێ تا نەتەوەیەکی زۆر لێکراوو کۆیلە بین. تۆ بڵێی هەر لەبەر ئەوەی ئێمە بە درێژایی ژیانمان شەرمان بەکەس نە فرۆشتووە، دەبێ شەرمان پێ بفرۆشرێ؟ هەر لەبەر ئەوەی نیشتمانی خەڵکێکی ترمان داگیر و کاول نەکردووە دەبێ ولاتەکەمان داگیر و کاول بکرێ؟ هەر لەبەر ئەوەی کولتوور و شارستانیی خەڵکی ترمان لەناو نەبردووە دەبێ کولتوور و شارستانیمان لەناو ببرێ؟!
پێدەچێ هێشتا بە پێی ئەم لۆژیکەی مێژوو بێ کە ئێمە وەک نەتەوە لەناو دەبرێین... وەک ولات تالان و ویران دەکرێین... وەک کولتوور و ژیانی رۆحی دادەتەپێندرێین.
بەڵێ ئێمە نامۆی نێوجەنگەڵی مێژووین...
یان مێژووی جەنگەڵ بە ئێمە نامۆیە!
مەگەر مێژوو ئەو ئەفسانە پووچەڵە نییە کە سەرکەوتووەکان ( واتا دەسەڵاتداران ) دەیئەوسنەوە؟!
مەگەر مێژوو ئەو درەختە بەردارە نییە کە زۆردارەکان بەروبومەکەی دەرننەوە؟!
سەرکەوتووەکان، کە خودانی مێژوون، هەمیشە لەسەر هەق بوون و لەسەر هەقن!
کەچی ژێر کەوتووەکان، کە خەڵکی بێ مێژوون ( بەلام بەراست خەڵکی بێ مێژوون؟!! ) هەمیشە خەتاکار و بگرە تاوانبارن!!

دەسەلاتداران، وەک چین و نەتەوە، تا ئیمڕۆ بە پێی ئەم لۆژیکە بەرەوڕووی مێژوو دەچنەوە...!
کەچی زۆرلێکراوان، دیسان وەک چین و نەتەوە، بەپێی هەمان لۆژیک، باجی مێژوو دەدەن!
ئێمە هەوڵێن نەتەوە نەبووین کە باجی ئەم لۆژیکەی مێژوومان داوە، کەچی لەوە دەچێ دوانەتەوە بین کەلەم باج وسزایەی مێژوو دەرباز بین.
بەلام بۆ ئەوەی دەرباز بین، یان دروستتر بلێم، زووتر دەربازبین دەبێ باشتر خۆمان بناسین... دەبێ چێتر دوژمنەکانمان بناسین...
بەلام بۆ ئەوەی خۆمان و دوژمنمان باشتر بناسین دەبێ ئاشنای مێژوو بین، هەرچەندە ئەم مێژووە هێشتا بە پێی لۆژیکی جەنگەڵ بەرێوە بچێ. ئەم کتێبە لافی ئەوە لێنادات کە پێناسەی مێژوو دەکات، یان لۆژیک و شوناسنامەی مێژوو بە خوێنەران دەناسێنێ. بەلام دەشێ هەوڵدانێکی سەرەتایی بێ تا سەرنجی پڕ لە پرسیار و گومانکارانەی خوێنەری کورد بۆ هەندێ گۆشەی تەماوی مێژووی خۆمان و مێژووی داگیرکەرانی دەرێنێ و ئیمڕۆی وڵاتەکەمان رابکێشێ... یان دەشێ بەردێک بێ و فڕێبدرێتە نێو زەلکاوی مێژوو... یان چریکەیەکی نێو جەنگەڵی مێژوو بێ!! بۆچی نا ؟!
مەگەر ئێمە لەیەک کاتدا بەرهەم و قوربانی دەستی ئەم مێژووە نارەوایە نین!!...
مەگەر داگیرکەرانی نیشتمانەکەمان، لەیەک کاتدا، بەرهەم و زەوتکەری ئەم مێژووە نین؟!
رەنگە لەبەر ئەم هۆکارانەیش بێ کە لە نووسینی ئەم باسەدا بایەخیم بە گێڕانەوەی ڕووداوەکان نەدابێ، بە تایبەتی کە مێژوونووس نیم تا

مێژوو بنووسمەوە. بەڵکو زیاتر ویستوومە ـ ئەگەر توانیبێتم ـ بە چاوێکی کراوە هەندێ ڕووداوی مێژوویی بخوێنمەوە و لەگەڵ یەکتریدا بەراوردیان بکەم تا هەندێ دەرەنجامی فیکرییان لێ هەڵێنجم . هەر لەم ڕوانگەیەشەوە سەرنجی هەندێ دیاردەی هاوچەرخم داوە، کە بیانووی و نیشانەی، لەسەر زەمینەی ڕووداوە مێژووییەکان وەستاون، یان لە نێو جەنگەڵەکەدا سەریان هەڵداوە!

ـ بەڵام ئاخۆ منێکی نامۆی مێژوو، یان بە مێژوو نامۆ توانیومە ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەنم؟!

ـ .........!!

رەفیق
١٩٩٠/١٢/١٣

## بەشی یەکەم

# مێژووی ناوچەگەری
# یان
# مێژووی سەرانسەری؟

ئێمە وەک نەتەوە بە درێژایی مێژوو ئیرادەی ئینسانی و نەتەوەییمان لێزەوت کراوە. خۆمان خودانی خاک و سەروەری نەتەوەیی و مێژووەکەمان نەبووین. مێژووی ئێمە، بە مێژووی فیکری و کولتووریشمانەوە، وەک وڵاتەکەمان داگیرکراوە.بۆیە ئێمە بە سەرجەمی مێژووەکەمان نامۆکراوین. لام وایە تراژیدیای داگیرکردن و کۆیلایەتی نەتەوەیی لێرەوە دەست پێدەکات.

ئەگەر بەشێکی ئەم بە مێژوو نامۆبوونە لەوەدابێ کە خۆمان خودانی مێژووی خۆمان نەبووین و پرۆسەی گەشەکردنی مێژووەکەمان شێوەیەکی سروشتیی، یان نیمچە سروشتیی بە خۆیەوە نەگرتبێ و چەندان بەش و قۆناغی گەشەداری کوێرکرابنەوە، ئەوا بەشەکەی دیکەی ئەم نامۆییە لەوەدایە کە پرۆسەی کارلێککردن و تەفاعولی نێوان قۆناغە مێژووییە گرنگەکانی کوردستان و، پەیوەندی ژیانی

مادی و رۆحیی نێوان بەشە لێکدابڕاوەکانی نەتەوەکەمان تا ئێمڕۆ سست و لاوازن.

مێژووی ئێمە لە زۆر رووەوە وەک کۆمەڵە رووداوێکی لێکدابڕاو نەک پێکەوە گرێدراو، وەک کۆمەڵە ئامانج و ئایدیالێکی لێک جیاواز نەک هاوبەش دێتە پێشچاو. بە واتایەکی تر مێژووی سەرانسەی نەتەوەکەمان لە زنجیرە رووداو و دیاردەیەکی پێکەوە لکاوی کوردستانی ناچێ کە یەک ئامانج و ئایدیالی هاوبەش پێکەوەی گرێدابن و، هەریەکەیان ئەوی تریانی تەواوکردبێ. یان هەریەکەیان زەمینەی بابەتی بۆ سەرهەڵدانی دیاردەی دوای خۆی خۆشکردبێ تا درێژەپێدەری سروشتیی هەمان پەیامی سیاسیی و، فیکری و رۆحیی دیاردەکەی پێش خۆی بێت.

ئەگەر مێژووی گرنگترین سەردەمەکانی هەریەش و هەرێمێکی کوردستان، بە مێژووی فیکری و کولتووریشەوە وەربگرین دەبینین تارادەیەکی زۆر لە مێژووی سەردەمەکەی پێش خۆی، یان لە مێژووی هەمان سەردەمی ناوچەیەکی دیکەی کوردستان جیاوازە. هەر سەردەمێکی مێژوویی کاتێ کۆتایی پێهێنراوە لەگەڵ خۆیدا دیاردە فیکریی و، سیاسیی و کولتوورییەکانی خۆی پێچاوەتەوە و ئیتر سەردەمێکی دی، لە بەشێکی دیکەی کوردستاندا دەستی پێکردووە بێ ئەوەی پەیوەندییەکی تەواوکارانەی بە ژیانی رۆحیی و مادیی سەردەمەکەی پێش خۆیەوە هەبێ.

ئەم دیاردە ناسرووشتییە بۆتە هۆی ئەوەی هێزی هەر رووداو و دیاردەیەکی مادیی و رۆحیی کۆمەڵگای کوردستان زیاتر تا سنوورێکی جوگرافی تەسک و تاکاتێکی دیاریکراو بڕ بکەن و، کاری

خۆیان لە بەشێکی کەمی نەتەوەکەمان بکەن. لێرەوە بەرای من پرۆسەی تەفاعولی نێوان مێژووی ئێمە و نێوان بەشەکانی نەتەوەکەمان پرۆسەیەکی بەش- بەش و قۆناخ- بە قۆناخ و هەرێمییە نەک سەرتاسەری. بە واتایەکی تر مێژووی ئێمە وەک یەک بابەتی یەکگرتوو... وەک یەک شێوە ژیان... وەک یەک زنجیرە خەبات و راپەرین... وەک یەک ئامانج و ئایدیالییەک نەتەوەکاری خۆی نەکردۆتە سەرنەوەیەک لە دوایەکەکانی. رەنگە لەبەر ئەم هۆکارە بێ خەڵکی هەریەش و هەرێمێکی کوردستان زیاتر بەرهەمی مێژووی تایبەتی بەش و هەرێمەکەی خۆیان بن، نەک بەرهەمی مێژووی سەرتاسەری نەتەوەکەمان، زیاتر هەست بە ئینتیمایی هەرێم یان بەشە کوردستانەکەی خۆیان دەکەن نەک بە ئینتیمای سەراسەری کوردستانی.

بۆنموونە:

وەک دەزانین لە ناوەراستی سەدەی شانزەیەم را کوردستانی باکوور، لە سایەی هەندێ لە میرنشینە کوردەکاندا (میرنشینی بەتلیس، هەکاری و جزیرە و...هتد) سەرەتای بوژاندنەوەیەکی ئابووریی و، سیاسیی و کولتووری فراوانی بە خۆیەوەبینی. بە پشتبەستن بە شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی و سیاحەتنامەکەی ئەولیا چەلەبی و مەم و زینی خانی، ژیانی شارستانیی ئەو سەردەمانەی کوردستانی باکوور لە ئاستێکی بەرچاو و پێشکەوتووی سەردەمەکەی خۆیدابووە. دەشێ دروستبوونی شێوە زمانی ئەدەبی کرمانجی سەروو، دەرکەوتنی مەلای جزیری، عەلی هەریری، فەقێ تەیران و خانی مەزن بە نیشانە و بەرهەمی ئەو شارستانیە دابنێرێن. د. عیزەدین رەسووڵ دەڵێ:

(دەرکەوتنی قوتابخانەیەکی نوێی شیعری لە «جزیرە و بۆتان» بەڵگەیەکی تری ئەو رابوونە سیاسی و ئابووری و شارستانییەیە کە ئەم ناوچە کوردییە لە سەدەکانی شانزەیەم و هەڤدەیەمدا بە خۆیەوە دیوە).(١)

بەلاّم کاتێک تورکەکان کوردستانی سەروویان بە تەواوی داگیرکرد و ژیانی کولتووری، ئابووریی و شارستانیی نەتەوەکەمانیان وێران کرد، دوای ئەوە نزیکەی دوو سەدەیەک کوردستانی باکوور وەک وڵاتێکی وێرانەی دوور لە دیاردەی بەرچاوی کولتووری و شارستانیی ماوەتەوە. ئایا بە ئەقڵدا دەچێ ئەو نەتەوەیەی بلیمەتانی وەک مەلای جزیری، خانی، شەرەفخانی بدلیسی، عەلی حەریری و فەقێ تەیرانی بووبێ، کەچی لە ماوەی دووسەدەیەکدا بلیمەتانی تری لێهەڵنەکەوتبێ؟

گەریدەی تورک ئەولیا چەلەبی، لە ساڵی ١٦٧٦ی زایینی لە کاتی داگیرکردن و وێرانکردنی شاری بدلیسدا لەگەڵ لیژنەی تالاّن نووسدا بووە ئەنیا لەم شارەدا، وەک دەنووسی:( حەوت باری خوشتر کتێبی بوون. کتێبخانەی تایبەتی میر پتر لە چوار هەزار دەستنووسی زۆر نایاب و بە هاداری تێدا هەبوو کە هەموو دەبەرگ گیراو و نەخشێنراوبوون: لەسەر ئاین و تاریخ و زمان و جانەوەر و گیا و گژ و پزیشکی و (تشریح) و پێوداتی شیعر و قافیە بوون و دیوانە شیعریش گەلێک بوون. زۆریش وێنە و نەخشە و تابلۆی نایابی هەبوو. هەر میر بۆخۆی ٧٦ کتێب و ١٠٥ نامیلکەی بە فارسی و عەرەبی دانابوون).(٢)

کاتێ کوردستانی سەروو وێرانکرا پێدەچێ هێشتا تیشکی کولتوور

و شارستانیەکەی بەر بەشەکانی تری کوردستان نەکەوتبێ، بە پێی ئاگاردی من بەڵگەیەکی مێژوویمان لەبەردەستدا نییە پێچەوانەی ئەم بۆچوونە بسەڵمێنێ.

هەر لەو سەردەمانە و دواتریشدا لە سایەی میرنشینی ئەردەڵاندا بەشێکی کوردستانی خوارووو و رۆژهەڵات گەشانەوەیەکی بەرچاوی ئابووری، کولتووری و شارستانییانەی بەخۆیەوە دیوە. دیالێکتی گۆران وەک زمانی ئەدەبی و زمانی رەسمی ئەم میرنشینە چەسپاوە. ( دەسەڵاتی سیاسی و هێزی ئەم ئەمارەتەش ئەدەبی بە دیالێکتی گۆرانی پێشخست و گەیاندییە لووتکەی داهێنان و گەشەسەندن).[3]

دەرکەوتنی شاعیران سەیدی هەورامی، بێسارانی، ئەحمەد بەگی کۆماسی، خانای قوبادی، وەلی دێوانە و مەولەوی لوتکە نیشانە و بەرهەمی شارستانیی گەشەداری ئەو سەردەمەن. ئەمین زەکی لایەنێکی ئەم ژیانە شارستانییە، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەمانوللاخان (١٧٩٨-١٨٢٤) باس دەکات و دەڵێ: (ئەم ئەمیرە زۆر زانست و زانایانی خۆش ویستووە و گیانی زانست و ئەدەب پەروەری و شارستانیەت و ئاوەدانیی بە ولاتدا بڵاوکردۆتەوە شاری سنە راپەڕینێکی گەورەی ئاوەدانیی و ئەدەبیی بە خۆیەوە دیوە، کۆشک و دەربارەکەی بۆتە کەعبەی شاعیران و ئەدیبان و زانایانی کوردستان و ئێرانیش).[4]

ئەم دیاردە شارستانییە لە هەمان دیاردەکەی پێشتری کوردستانی سەروو دەچێ، بێ ئەوەی بەرای من کارتێکردنی ئەوی پێوە دیاربێ، یان درێژەپێدان (امتداد)ی راستەوخۆی هەمان دیاردە شارستانییەکەی کوردستانی باکوور بێ.

هەروا لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا، بەشێکی تری کوردستانی خواروو، لە سایەی میرنشینی باباندا، ڕووی لە گەشانەوەیەکی ئابووری، سیاسی و کولتووری کرد، کە لە زۆر ڕووەوە لە دیاردەکەی کوردستانی سەروو، یان دیاردەکەی سەردەمی ئەردەڵانەکان دەچێ، بێ ئەوەی کارتێکردنی ئەوانی پێوە دیار بێ. لەو سەردەمەدا پلیمەتانی وەک نالی، شێخ مارفی نۆدێ، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، کوردی و سالم دەرکەوتن کە لووتکەی ژیانی ئەدەبی و فیکری و ڕۆحیی ئەو سەردەمەی نەتەوەکەمانن. هەروا شێوە زمانی ئەدەبی کرمانجی خواروو دروست بوو، کە ئیمڕۆ لە کوردستانی باشوور و ڕۆژهەڵاتدا، زمانی خوێندن و نووسینە.[٤]

بەڵام ناتوانین ئەم پرۆسە مێژووییە، بە هەموولایەن و شەقڵە شارستانییەکانییەوە، بە درێژەپێدەری پرۆسە مێژووییەکەی کوردستانی سەروو، یان کوردستانی ئەردەڵان دابنێین. ناتوانین نالی، کوردی و سالم بە درێژەپێدەری سەیدی هەورامی، بێسارانی و خانای قوبادی و...هتد دابنێین. ناتوانین شاعیران و بیرکارانی سەردەمی ئەردەڵانەکان و بابانەکان بە درێژەپێدەری مەلای جزیری، خانی، عەلی هەریری و فەقێ تەیران ناوبەرین. چونکە هیچ کامییان نەیانتوانی ببنە ناوەندێکی سەرەکی بۆ بەش و ناوچەکانی تری کوردستان.

لێرەوە لام وایە دەشێ سەربەخۆ لە زۆر قۆناخی مێژوویی و کولتووری نەتەوەکەمان بکۆڵینەوە، بێ ئەوەی بە جۆرێکی حەتمی بە قۆناخێکی ترییەوە ببەستینەوە- دەتوانین بە جیا باسی ژیانی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، فیکری و ئەدەبی سەردەمی ئەردەڵانەکان و بابانەکان بکەین بێ ئەوەی بە ئەڵقەیەکی تەواوکارانەی سەردەمی

میرنشینی بدلیس و جزیره و هەکاری دابنێین. دەشێ لە ڕاپەڕینی شێخ عوبێدوڵلای نەهری و لە بزوتنەوەی ڕۆشنگەریی (التنویر) ی و سیاسی سەرەتای ئەم سەدەیەی کوردستانی باکوور، کە ڕواڵەتەکانی لە دەرچوونی ڕۆژنامەی (کوردستان) و دامەزراندنی چەند ڕێکخراوێکی سیاسی و کۆمەڵەیاتیدا دەرکەوتن، بکۆڵینەوە بێ ئەوەی بە بزووتنەوەی سیاسی و کولتووری سەردەمی بابانەکان، یان ئەردەڵانەکانی ببەستینەوە. دەتوانین لە دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد بە سەرۆکایەتی پێشەوای نەمر قازی محەمەد بکۆڵینەوە بێ ئەوەی بەم بزوتنەوە سیاسی و ڕۆشنگەری و کولتووریانە و، تەنانەت بە شۆرشەکەی شێخ مەحموودی نەمری ببەستینەوە!. لەوەش کارەسات تر ئەوەیە ئەم دیاردەیە تا ئێستا هەر بەردەوامە!!

ئایا کوردێکی کوردستانی باکوور چی دەربارەی ژیانی فیکردیی، کولتووری، سیاستیی و خەباتی چەندان سەدەی نەتەوەکەی لە کوردستانی خواروو و ڕۆژهەڵاتدا دەزانێ؟! تا چەند لەژێر کارتێکردنییان دایە؟ یان خەڵکی کوردستانی ڕۆژهەڵات و خواروو چی دەربارەی میراتی فیکردیی، کولتووری و خەباتی چەند سەدەی نەتەوەکەیان لە کوردستانی باکووردا دەزانن؟ ئەم میراتە چ ڕۆڵێکی لە دروستبوونی کەسایەتی ئەم خەڵکەدا گێراوە؟ ئایا ناکرێ ئەم نامۆبوونە کولتووری و مێژوویی و سیاسیەمان بە هۆکارێکی سەرەکی بەخۆنامۆبوونی نەتەوەیی و داتەپینی هۆشیاری نەتەوەییمان دابنێین؟!

ئایا لێکدابڕانی نەتەوەیی و کار لە یەکتری نەکردنی ئەم دیاردە

مێژوویی و سیاسیی و فیکریی و کولتوورییانە تەنیا بۆ شاڵاوی داگیرکەران و لە بارچوواندن و جوانەمەرگ کردنی خودی ئەم دیاردانە دەگەڕێتەوە؟... یان بۆ لێکدابڕاتی جوگرافیی کوردستان!... یان بۆ وێراتکردنی ژیاتی ئابووری و ڕێنەدان بە گەشەکردنی پەیوەندی نوێی ئابووری- کۆمەڵایەتی...؟ یان بۆ هێز و وزەی سیستمی فیودالی و عەشیرەتگەری؟... یان بۆ نەبوونی یەک ئامانج و ئایدیالی هاوبەش و نەبوونی یەکێتی ژیانی ڕۆحی نەتەوەی کورد؟!.

ئایا دەتوانین باسی کام ئامانج و ئایدیالی نەتەوەیی هاوبەش و کام ژیانی ڕۆحی هاوبەشی نێوان (وەک نموونە) میرنشینەکانی بابان و ئەردەلان بکەین لە کاتێکدا بە درێژایی دەیان ساڵ سەرقاڵی پەلاماردان و پێکدادانی یەکتری بوون؟ ئایا لەم بارودۆخەدا دەشێ چ ئاڵوگۆڕ و (تفاعلیک)ی کولتووری لە نێوان ئەم دوو میرنشینەدا ڕوو بدات؟ دەتوانین باسی کام هەستی نەتەوەیی هاوبەش و کام ئامانجی نەتەوەیی هاوبەشی میرنشینی سۆران بکەین لە کاتێکدا میری سۆران قەتلوعامی بە کۆمەڵی یەزیدییە (کافرەکانی!) دەکرد؟. کامەیە ئایدیاڵ و ئامانجی نەتەوەیی هاوبەشی خودی بابانەکان لە کاتێکدا زۆربەی میرەکانی لەبەر خۆپەرستی و دەسەلاتپەروەری، شەرمهێنەرانە لەشکری داگیرکەراتیان دوای خۆیان دەخستن و کوردستانیان پێ کاول دەکردن.

مێژوونووسی کورد عەبدولقادری ڕۆستەمی بابان کە لەنێو ڕووداوەکانی سەردەمی بابانەکان و ئەردەڵانەکاندا ژیاوە هەندێ ڕووداوی سەیرمان سەبارەت بە خۆخۆری هەندێ لە میرانی بابان بۆ دەگێڕێتەوە، کە چۆن هەندێکیان بە مەبەستی دەسەڵات زەوت کردن

لە مام و براکانیان، لە بەغداوە لەشکری عوسمانییان دوای خۆیان خستووە تا دەست بەسەر سلێمانیدا بگرن. هەندێکی دیکەیان، بۆ هەمان مەبەست، لەشکری ئێرانیان تاسلیمانی دوای خۆیان داوە. ئەم تراژیدیا- کۆمیدیایە لە سەردەمی جووتەبرا سلێمان پاشا و مەحموود پاشادا گەیشتۆتە لووتکە، کاتێ وەک نووسەر دەڵێ: (ئەم جووتە برایە لە ماوەی چوار ساڵدا، یەکیان بە یارمەتی لەشکری عوسمانی و ئەویتریان بە یارمەتی لەشکری ئێرانی، شەش جار بەنۆرە بەسەر وڵاتی باباندا زاڵ بوون و، وڵات لە دەستدرێژی ئەوان تووشی وێرانی و چارەڕەشی بوو).(٦)

پیرەمێرد لە یاداشتەکانیدا بە ناهەق ئەینووسێ کە (سلێمانی لە تێپتیدای تەشکیلییەوە هەرچی ئەبوو بە حوکمدار برایچووکەکەی دەری ئەپەڕاند).(٧)

لێکدابڕانی نەتەوەکەمان، لەبەر هەر هۆکارێکی خۆیی و بابەتی، نێوخۆیی و دەرەکی بێ، تائێستە گیروگرفتی گەورەیان لەبەردەم سەرجەمی ژیانی مادیی و ڕۆحیی نەتەوەکەمان، بە تایبەتی بۆ بزووتنەوە ڕزگاریخوازییەکەی دروست کردووە. بەڕای من ناشکرێ لێکدابڕانی کولتووری و نەتەوەیی نێوان بەشەکانی کوردستان و پرش و بڵاوی نێوان لایەنەکانی بزووتنەوەی کورد تەنیا بە ئەنجامی دابەشکردنی نوێی کوردستان (واتا دوای جەنگی یەکەمی جیهان) دابنرێ، بەڵکو مێژووەکەی زۆر لەوە کۆنترە. دەشێ خودی ئەم لێکدابڕانە مێژووییە یاریدەدەرێکی دابەشکردنی نوێی کوردستان بووبێ کە ئیمپریالیستەکان توانییان بە سووک و ئاسانی گەمە بەچارەنووسی سەرجەمی نەتەوەکەمان بکەن و وڵاتەکەمان بەسەر

خەڵکی تردا بپەشێنەوە، بۆ ئەوەی رووبەرووی بەرەنگاربوونەوەیەکی کوردستانی، یان یەکگرتوانەی فراوان ببنەوە.

لام وایە مێژوویی ئێمە وەک یەک بابەتی یەکگرتوو، وەک یەک شێوە ژیان و یەک چارەنووسی هاوبەش... وەک یەک زنجیرە خەبات... وەک یەک هێزی هاوبەشی مادیی و رۆحیی وەک ئامانج و ئایدیاڵی هاوبەشی یەک نەتەوە، هێشتا کاری خۆی نەکردۆتە سەر ئێمە... مێژووی ئێمە، بە مێژووی فیکریی و کولتووریشمانەوە، هێشتا کەرەسەیەکی خاوە و نەکراوەتە

هۆکارێکی پەروەردەکردنی مرۆڤەکانی کوردستان، نەکراوەتە ئەو میرات و سامانە نەتەوەییە هاوبەشەی هەر مرۆڤێکی کورد لەهەر بەشێکی کوردستاندا بۆ پێی شارەزابێ و شانازی بەلایەنە گەشەدار و شۆرشگێر و دیموکراتخوازەکانیەوە بکات. بۆیە ئێمە زیاتر بەرهەمی بەشێکی مێژووی نەتەوەکەمانین نەک بەرهەمی سەرجەمی مێژووەکەمان... خەڵکی هەر پارچە و هەرێمێکی کوردستان زیاتر کەوتوونەتە ژێر کارتێکردنی مێژووی هەرێمەکەی خۆیان نەک مێژووی هەموو کوردستان... هەر بەشەمان سەرقاڵی گیروگرفت و بەرژەوەندییەکانی بەشەکەی خۆمانین نەک بەرژەوەندی هەموو نەتەوەکەمان... ترێلێی لە ئەنجامی ئەم دیاردەیەدا نەبێ کە ئێمرۆ لەگەڵ ئەوەی گەلەکەمان رووبەرووی مەترسی لەناوبردنی فیزیکی و رۆحی بۆتەوە، کەچی تائێستا بیری سیاسی کوردستانی... بیری یەکێتی خەباتی کوردستانی... دەرککردن بە یەکێتی چارەنووس و ئایدیاڵ و ئامانجی کوردستانی بە رادەیەک لە نێو ئێمەدا لاوازە کە لایەنەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستان ناتوانن

لەسەر سادەترین بەرنامەی هاوبەشی کوردستانی رێک بکەون. یان کاتێ بەشێکی نەتەوەکەمان لەتار دەبرێ کەچی هێزە سیاسییەکانی بەشێکی دیکەی نەتەوەکەمان بێدەنگ دەبن لە لاشیان شەرم نییە کە تەتانەت هێندەی خەڵکی نەناس و بیانی لەسەر نەتەوەکەی خۆیان بە دەنگ نایەن.

لێرەوە پێشنیار دەکەم لەسەرەتادا بۆ مێژووی نەتەوەکەمان بگەرێینەوە، ئابتوانین سەرجەمی ئەم مێژووە، وەک یەک بابەتی پێکەوە گرێدراو بکەینە هێزێکی نوێی مادی و رۆحی نەتەوەکەمان. ئائینە و نەوەکانی ئایندەمان، بە پێچەوانەی باپیرانمانەوە بیینە بەرچەمی مێژووی سەرانسەری نەتەوەکەمان نەک مێژووی هەرێمەکەمان.. بیینە هەڵگری ئامانج و ئایدیاڵی هاوبەشی نەتەوەکەمان نەک تەنیا ئایدیاڵ و ئامانجی تەسکی ناوچەکەمان. ئابتوانین کوردستانیانە، نەک هەرێمچیانە بیر بکەینەوە و کار و کۆشش بۆ ئایندەی هاوبەشمان بکەین.

ئەگەر فیکر و (هۆشیاریی) نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیمان رەنگدانەوەی واقیعی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیمان بێت، ئەوا گۆرینی ئەم واقیعە سەپاوەی کوردستان پێویستی بەداهێنانی فیکر و هۆشیارییەکی نوێی ئەوتۆ هەیە کە بیێتە هێزێکی مادی نەتەوەکەمان.

# سەرچاوە و پەراوێزەکان

١- الدكتور عزالدين مصطفى رسول، احمدى خانى شاعرا ومفكرا، كلية الآداب، جامعة بغداد- ١٩٧٩ ل٨٩.

٢- شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی، هەژار کردوویە بە کوردی- چاپی دووەم تاران- ١٩٨١. پەراوێزی مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی ل٧٨٧- ٧٨٨- هەروا بڕوانە: محمد امين زكي- خلاصة تاريخ الكرد وكردستان. الجزء الاول- ترجمة محمد علي عوني- الطبعة الثانية- پەراوێزی ل٢٠٦.

٣- ئەنوەر قادر محەممەد- لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، ستۆکهۆلم ١٩٩٠ ل٣٩.

٤- هەمان سەرچاوە ل٣٩.

٥- بۆ زیاتر لەم ڕووەوە بڕوانە: د. عیززەدین مستەفا ڕەسووڵ. چەند سەرنجی دەربارەی زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی، بەغدا ١٩٧١. هەروا بڕوانە وەلید سابیر، سەرەتایەکی مێژوویی دەربارەی سەرهەڵدانی هۆشیاری خۆیی نەتەوەیی لە کوردستاندا. گۆڤاری (ڕێگای ئاشتی و سۆسیالیزم، ژمارە (٩)ی ساڵی ١٩٨٧.

٦- بڕوانە: عبدالقادر ابن رستم بابانی، تاریخ وجغرافیای کردستان موسوم به سیر الاکراد، بکوشش محمد رئوف توکلی. چاپخانەی آرژنگ ١٣٦٦- ئەم کتێبە لەلایەن مامۆستا کەریمی حیسامی-یەوە کراوە بە کوردی.

٧- یادداشتەکانی پیرەمێرد، ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا. ڕۆژنامەی (ئاسۆ)، بەغدا ژمارە (٤٨) ڕۆژی ٢٣/٦/١٩٩٠.

بەشی دووەم

# ئەنترۆپۆلۆژیای ئیسلام و بە خۆنامۆکردنی نەتەوەی کورد

### کورتە پێشەکییەک:

لام وایە بەشێکی بە مێژوو نامۆبوونمان، یان نامۆیی مێژووییمان لەوەدایە کە چەندان قۆناخی گرنگی مێژووی نەتەوەکەمان کوێرکراونەتەوە و، ئیمڕۆ جگە لە هەندێ زانیاری پچڕ- پچڕ شوێنەوارێکی دیکەیان نەماوە.

دەشێ قۆناخی چەند سەد ساڵەی پێش سەپاندنی ئایینی ئیسلام بەسەر کوردستاندا بەزەقترینی ئەو قۆناغە وێرانکراوانە دابنرێ، کە ئیمڕۆ شتێکی ئەوتۆ دەربارەی ژیانی مادیی و رۆحیی ئەو سەردەمەی نەتەوەکەمان و ئاستی شارستانی و کولتوور و شێوە زمانەکەی و...... هتد نازانین. پێدەچێ تۆفانەکە بە رادەیەک وێرانکارانە بووبێ کە هەموو شتێکی لەگەڵ خۆیدا راماڵیبێ.

ئەم دیاردەیە تایبەتمەندی ئایینی ئیسلام و سروشتی ئیسپانەی

ئامانجە مێژووییەکەی دەردەخات. چونکە ئەم ئاینە لە کاتێکدا بۆ کۆمەڵگای دوورگەی عەرەب، کە سەرچاوەی دەرکەوتنی بوو، شێوەی کودیتا، یان شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بەخۆ گرت و، ڕۆڵێکی مەزنی بۆ پەکخستنی ژیانی فیکریی و ڕۆحیی و نەتەوەیی گەلی عەرەب گێڕا، کەچی هەر هەمان ئاین لە کوردستان و گەلێ ناوچەی تردا نەک هەر ڕۆڵێکی پۆزەتیڤانەی دیاری نەکرد، بەڵکو دیوارێکی بەرزی لەبەردەم گەشەکردنی ژیانی فیکری و کولتووریدا هەڵچنی و بگرە ژیانی ڕۆحی و نەتەوەییمانی وێرانکرد.

لە هەمان کاتدا ئەم دیاردەیە، واتا ڕۆڵی نیگەتیڤانەی ئیسلام لە کوردستاندا، ئارادەیەک ئەنجامی ئەو جیاوازییە بوو کە لە نێوانی ئاین، هەر ئاینێ، وەک دیاردەیەکی سەربەخۆ و، لە نێوانی لایەنی ئەنترۆپۆلۆژی ئاییندا هەیە. چونکە ئاینی ئیسلام، وەک هەر ئاینێکی تری ئاسمانی لە دوو لایەن، یان جەمسەر پێکهاتووە. لایەنێکیان خودی ئاینەکەیە وەک ناوەڕۆک و دیاردەیەکی ڕۆحی ڕووت، لایەنەکەی دیکەشی ئاستی ئینگەیشتن و شێوەی پیادەکردنیەتی لەلایەن خودی مرۆڤەوە. لێرەدا من نامەوێ باسی ناوەڕۆکی ئاینی ئیسلام بکەم، بەڵکو لایەنە ئەنترۆپۆلۆژیەکەیم مەبەستە، بەو پێیەی هێندەی ئاین، کولتوور و شارستانی نەتەوەیەک دەهێنێتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، دەشێ هێندەش کولتوور و شارستانیی نەتەوەیەک ئاین پەلکێشی ژێر ڕکێفی خۆی بکات، واتە ئاین ببێتە بەشێک لە کولتوورەکە، یان وەک چۆن ئاین هەوڵ دەدات مرۆڤ بگۆڕێ، ئەوا مرۆڤیش لای خۆیەوە ئاینەکە دەگۆڕێ.[1]

بۆیە هەر ئاینێکی ئاسمانی چەند خۆی بە دیاردەیەکی سەربەخۆی

بێبەست (مطلق)دا بێ، ئەوا لە رووی ئەنترۆپۆلۆژییەوە رێژەیی (نیسبی)یە، واتا ئەو مرۆڤانەی هەڵگری ئایینەکەن بەپێی بۆچوون و تێگەیشتنی خۆیان و لە روانگەی بەرژەوەندی تایبەتی و نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی جۆربەجۆری خۆیانەوە سەیری ئایینەکە دەکەن و بەرخوردی لەگەڵدا دەکەن. بۆیە لەهەر ئایینێکدا چەندان رێباز و مەزهەب و بزووتنەوەی فیکری، سیاسی و کۆمەڵایەتی سەریان هەڵداوە و هەریەکەشیان رەچەڵەکی خۆیان بۆ سەرچاوەی رەسەنی ئایینەکە دەگێڕنەوە و، لە راستیشدا هیچیان بە خودی ئایینەکە نامۆنین.

***

سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام لە دوورگەی عەرەبدا پەیوەندییەکی راستەوخۆی بە گەشەکردنی ژیانی ئابووری و، بە تایبەتی ژیانی بازرگانیی ئەو سەردەمەی دوورگەی عەرەبەوە هەبوو.(٢)

سەرهەڵدانی پەیوەندی نوێی ئابووری- کۆمەڵایەتی لەگەڵ لێکدابڕانی خێڵەکی و تیرەگەری نەدەگونجان و پێویستیان بەرەبوو ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆحیی خەڵکی دوورگەی عەرەب رووە و یەکگرتن بڕۆن. دیاردەی بتپەرستی، کە بە ئەندازەی ژمارەی بتەکان خەڵکی عەرەبی بەش- بەش کرد بوو گەورەترین هۆکاری لێکدابڕانی رۆحی- فیکریی گەلی عەرەب بوو. بۆیە هەوەڵین کارێکی فیکری- رۆحی بۆ یەکخستنی (توحید)ی تیرەو هۆزە لێکدابڕاوو پێک ناکۆکەکانی عەرەب، وەک پێداویستییەکی یەکخستنی ژیانی ئابووری، دەبوایە بە نەهێشتنی دیاردەی بتپەرستی و، چەسپاندنی (توحید)ی رۆحی و باوەڕهێنان بە تاکە خوداوەندێکی هاوبەش دەست پێبکیات. ئەم پرۆسەیە کە بە هۆی ئایینی ئیسلامەوە لەنێو عەرەبدا

چەسپا، گەورەترین هۆکارێک بوو بۆ یەکخستنی ئایینی و قەومی و سیاسی خەڵکی دوورگەی عەرەب.

لە هەمان کاتدا ئایینی ئیسلام ڕۆڵێکی مێژوویی تری گێڕا، کاتێ وەک شۆڕش یان کۆدیتایەکی کۆمەڵایەتی زۆربەی دیاردە کۆمەڵایەتییە چەوتەکانی وەک فەساد و ژن هەراج کردن و زیندوبەچاڵکردنی کچان و پێکدادانی خێڵەکی و... هتد کۆتایی پێهێنا و بۆ ماوەیەکی زۆر کۆمەڵگای دوورگەی عەرەبی لە داڕزانی کۆمەڵایەتی دەربازکرد.

بەڵام کاتێک ئایینی ئیسلام لە ڕێگەی فتوحاتەوە بۆ دەرەوەی دوورگەی عەرەب بە ڕێکراو، بەزەبری شمشێر و داگیرکردنی خوێناوی بەسەر گەلانی تر، لەوانە بەسەر گەلی کورددا، سەپێندرا ئەوا نەیتوانی و مەحاڵ بوو بتوانێ، لەو کۆمەڵگایە نوێیانەدا هەمان ڕۆڵە مێژووییەکەی بگێڕێ و هەمان ئەرکی کۆمەڵایەتی، فیکری و نەتەوەیی بە ئەنجام بێنێ. چونکە زۆربەی گەلانی تر، بە پێچەوانەی کۆمەڵگای داڕزاوی بتپەرستی عەرەبەوە خاوەنی ئایینی تایبەتی خۆیان بوون و جۆرە یەکبوونێکی ڕۆحی- ئایینی پێکەوەی گرێدابوون، سەدانساڵیش بوو باوەڕیان بە یەزدانی هاوبەشی خۆیان و بە یەکێ لە ئایینەکانی وەک زەردەشتی، موسایی، عیسایی هێنابوو. لە ڕووی ژیانی نەتەوەییشەوە بۆ ئەمان نەک هەر ئەو هۆکارە ڕۆحی و فیکرییە نەبوو کە پێکیانەوە گرێ بدات، بەڵکو بۆ ئەمان کارەساتێکی نەتەوەیی ڕاستەقینە و بگرە سەرەتای نامۆیی ڕۆحی و نەتەوەیی بوو.

هەروا کاتێ لەشکری عەرەبی ئیسلام کەوتە پەلاماردانی وڵاتانی تر و ناردنە دەرەوەی ئایینی ئیسلام، ئەم ئایینە لەنێو خودی کۆمەڵگای

دوورگەی عەرەبدا ناوەڕۆکە کۆمەڵایەتییەکەی لەدەست دابوو، لە ڕیفۆرم یان شۆڕشێکی کۆمەڵایەتییەوە کرابوو بە سیستەمێکی ئولیگارشی بازرگانە کۆیلەدار و دەوڵەمەندەکانی قورەیش و هەموو هێز و دەسەڵاتێکی ئەم سیستەمە لە چنگی ئەم بازرگانانەدا گردبووە. ئەم بازرگانە دەوڵەمەندانە کە لە سەرەتادا، لە ترسی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانیان بەربەرەکانی ئیسلامیان کرد و لە دژی ڕاوەستان دواتر توانییان دەسەڵاتی سیاسی و عەسکەری ئیسلام بکەنە باشترین هۆکارێک بۆ کۆکردنەوەی زیاتری سامان و زۆرکردنی ژمارەی کۆیلەکانیان و پەرەپێدانی سنووری زەوی و زارەکانیان. ئەمەش یەکێک بوو لە هۆکارە سەرەکییەکانی سەرهەڵدانی پرۆسەی فتوحات و پەلاماردانی خاک و وڵاتی گەلانی تر، چونکە لەگەڵ داگیرکردنی هەر ناوچە و وڵاتێکی نوێ تاڵان و داراییەکی بێ سنوور و هەزاران کۆیلەی نوێیان دەستدەکەوت. ئەم بەسەرهاتەش بۆ وڵاتە داگیرکراوەکان نەک هەر کردنتا، یان شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی نەبوو بەڵکو کارەساتێکی مێژوویی بوو.

لە کوردستاندا ناوەڕۆکی ئەم کارەساتە مێژووییە لەوەدابوو کە لە پاڵ وێرانکردنی ژیانی ئابووری و بە کۆیلەبردنی هەزاران، ژیانی کولتووری و فیکریی و ڕۆحیی کورد تێکدران. سەرجەمی مێژووی سیاسی و فیکری و ئەدەبی پێش ئیسلام ڕەشکرایەوە. دوای ئەوەیش گەلی کورد بە زمان و کولتوور و ژیانی نەتەوەیی خۆی نامۆکرا. بە درێژایی چەندسەدەیەک باشترین وزەی فیکر و کولتووری نەتەوەکەمان بۆ خزمەتی فیکر و کولتووری عەرەبی ئیسلامی تەرخان کران.

هێرشی لەشکری موسڵمانانی عەرەب بۆ سەر کوردستان ئەوەندەی داگیرکردنێکی ئابووری بوو هێندەش داگیرکردنێکی کولتووری، فیکری و ڕۆحی بوو، چونکە ئەوان دەیانەویست فیکر و کولتووری خۆیان، وەک ئایدیا و بۆچوون و جیهانبینی و زمان، کە تەواو بە کولتوور و فیکر و زمانی کوردی نامۆ بوون، بسەپێنن. ئەمەش تەواوکەری، یان چەسپێنەری پرۆسەی داگیرکردنە سیاسییە- ئابوورییەکە بوو.

ناوەرۆکی ئەم داگیرکردنە فیکری و کولتوورییە لەوەدابوو کە بەپێی میتۆدی دەسەڵاتی ئیسلام، دەبوو فیکر و کولتوور و فەلسەفە لە ئیسلامەوە دەست‌پێبکات، ئەوەی لە پێش ئیسلامدا نووسراوە ئەوا بەرهەمی کوفر و زەندەقەیە ، دەبێ بسووتێندرێ و لەناوببرێ. لەم ڕێگەیەوە دەیانەویست ڕیشەی ئایین و ئایدیای پێشووی خەڵکەکە لە ویژدان و بیریاندا هەڵکێشن، تا بە تەواوی لە ڕابردووی مێژوویی و فیکری و ڕۆحیی و نەتەوەیی و هەرشتێ بە ڕابردوویانەوە بیبەستێتەوە دابڕێن و وەک درەختێکی بێ‌ڕەگ و ڕیشەیان لێبێت.

لەم بۆچوونەوە بوو کاتێ لەشکرێ ئیسلام هێرشی بۆسەر ئێران (بە کوردستانیشەوە) برد، عومەری کوڕی خەتتاب (عمر بن خطاب) وەک ئیبنوخەلدون لە (المقدمە)دا دەڵێ، فەرمانی بۆ لەشکرەکە دەرکرد هەرچی کتێب و نووسراوێکیان بەردەست کەوت بیسووتێنن- بە پێی هەمان میتۆد و عەقڵیەت کتێبخانە مەزن و بەناوبانگەکەی شاری ئەسکەندەرییەیان سووتاند. دیارە ئەوان دەیانزانی گەلانی ئەو سەردەمی ئێران خودانی چ کولتوور و شارستانییەکی دێرینن و، دەرکیان بەوە دەکرد کە بەبێ لەناوبردنی ئەم کولتوور و شارستانییە و بەبێ لە

ریشە هەڵکێشانی ئایینی زەردەشتی و مانی، کە بناخەی ئەم کولتوور و شارستانییە و چاوگەی یەکێتی ژیانی روحی ئەو گەلانە بوون، مەحاڵە بتوانن کولتوور و ئایدیاڵ و ئایین و سیستمی رۆحیی خۆیان بسەپێنن و درێژە بە داگیرکردنە سیاسیبە- ئابوورییەکەیان بدەن.

ئێمە تائێستا نازانین لەو سەردەمەدا چەند بەرهەمی ئەدەبی، فیکری، فەلسەفی و مێژوویی نەتەوەکەمان لەناوچوون.. نازانین ئاخۆ ژیانی ئایینی و فیکری و کولتووری و شارستانیی ئەو سەردەمەمان لە چ ئاستێک دابووە... ئەو شێوە زمانە ئەدەبییەی ئەو سەردەمە بەکارهاتووە تا چ ئەندازەیەک لە شێوە زمانی بابەتاهیری هەمەدانی، یان بیسارانی و خانای قوبادی، یان مەلای جزیری و خانی، یان شێوە زمانی ئەدەبی کرمانجیی خواروو نزیک بووە؟![3] ئایا کام مەزهەبی زەردەشتی زیاتر لە کوردستاندا باوبووە؟... ئایینەکانی تری عیسایی و مرسایی، یان یەزیدی تا چەند لە کوردستاندا بڵاوبوون...؟ ئاخۆ ژیانی رۆحیی گەلی کورد، لەسەر بنچینەی ئەم ئایینە تا چ ئەندازەیەک یەکگرتوو بووە؟- ئێمە شتێکی ئەوتۆ دەربارەی ئەم مەسەلانە و چەندان مەسەلەی تر نازانین، چونکە هەرچیمان هەبوو کەم یان زۆر بوون، باش یان چەوت بوون، گەشەداریان دواکەوتووبوون هەمووی، لەتاوبران. بە مەیش ئێمە لە مێژوویەکی سەدان ساڵەی خۆمان دابڕاین و بەسەرجەمی رابردووی فیکری و ئەدەبی و رۆحیی خۆمان نامۆکراین.

دەبوو ئێمە وەک نەتەوە لەو رۆژە بە دواوە لەتاربچین و، وەک چەندان گەل و نەتەوەی تر، کە پێشیان دوای ئەو سەردەمە توانەوە، شوێنەوارمان نەمێنێ. بەڵام کە لەناونەچووین خەتاو (گوناهـ) و

کەمتەرخەمی داگیرکەران نەبوو. بەڵکو (خەتای) سەرسەختی و سەرکەشی نەتەوەی کورد و سروشتی سەختی کوردستان بوو. ئیمە نەک هەر لەناونەچووین، بەڵکو ئەو هەزاران موسڵمانە عەرەبەی لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامدا لە کوردستان نیشتەجێ کران و لە پاداشتی سەرکەوتنەکانیان ماڵ و سامان و ژن و منداڵی کوژراوە (کافرەکانیان) بەپێی ئایەتی (الانفال) و (النساء) [4] زەوت کرد ئەوان لەنێو کورددا توانەوە و بوون بە کورد.[5]

سەپاندنی ئیسلام لە کوردستاندا کۆتایی بە قۆناخێکی مێژوویی و فیکری و کولتووری نەتەوەکەمان هێنا و ژیانە روحییەکەی شێواند. لە ئەنجامدا دوچاری بە خۆنامۆبوون و تەنگوچەڵەمەیەکی رۆحی و کولتووری و نەتەوەیی هێندە سەخت هات کە دواتر و تائێستاش بە تەواوی لێیان دەرباز نەبووە. چونکە پرۆسەی سەپاندنی ئیسلام لە کوردستاندا، سەردەمێک بوو کە کوردستان ژێردەستەی ساسانییەکان بوو. کۆمەڵگای کوردستان لە رووی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە لە ئاستێکدا نەبوو کە نەتەوەی کورد، بۆ نموونە وەک نەتەوەی فارس و تورک بتوانێ ئایینی ئیسلام بخاتە ژێر رکێفی نەتەوەیی و کولتووری خۆیەوە. کۆمەڵگای کوردستان لەو ئاستەدا نەبوو کە هەرنەبێ لەچەند ناوچەیەکدا شێوە سیستمێکی ئەوتۆی پێکەوە گرێدانی دەرەبەگی دروست بووبێ کە لە سایەیدا تۆخمە سەرەتاییەکانی رێکخستنی دەوڵەتی، یان شێوە رێکخستنی میرنشینی دەرکەوتبێ.

بۆیە هێشتا (کورد تەکامولی نەتەوەیی بە هەموو نیشانە و ماکە ئیتنیکییەکەوە، لەپێش هەموویانەوە خۆناسینی ئیتنیکی بەرزی نەبووە)*. هەروا پێناچی ژیانی کولتووری و فیکری ئەو سەردەمەی

کوردستان ئاستێکی هێندە پێشکەوتوویان بووبێ کە بتوانن لە بەردەم کولتوور و فیکری عەرەبی ئیسلامی‌دا خۆیان راگرن.
دەشێ لەبەر ئەم هۆکارانەیش بێ کە ئایینی ئیسلام بەم جۆرە نەتەوەی کوردی هەڵتەکاندبێ. یان ئەو زیاناتەی لەم رێگەیەوە بە کورد گەیشتبێ چەند جار لەو زیانانە گەورەتر بووبێ کە بە گەلانی تری ناوچەکە گەیشتبێ.
بۆ نموونە گەلی تورک کە کۆمەڵە هۆزێکی شەرکەربوون و لە ئاسیای نێوەراستەوە روویان کردە ناوچەکە و خاکی خەڵکی تریان داگیرکرد و تیایدا نیشتەجێ بوون، ئەوان لەچاو کورد لە ئاستێکی کۆمەلایەتی پێشکەوتووتر بوون، سیستەمێکی فیودالی کۆچەرییان پێکهێنابوو کە لە پرۆسەی شەر و شۆر و پەلاماردانیدا ناوەندێکی عەسکەری- شێوە دەوڵەتی بەخۆگرتبوو، بۆیە ئەوان لە وەرگرتنی ئایینی ئیسلامدا نەک هەر زیانێکی کولتووری و شارستانییان پێنەگەیشت بەلکو زۆری نەبرد توانییان دەسەلاتی خەلافەتی ئیسلام زەوت بکەن و ناوەندی خەلافەتی ئیسلام بگوازنەوە بۆ ئەستەمبوڵ. بەمەیش قۆناخێکی تری سیاسی- فیکری لە مێژووی دەسەلاتی ئیسلام دەستی‌پێکرد و ژیانی کولتووری فیکری ئیسلامی بە گشتی و عەرەبی بە تایبەتی بەرەو تاریکی و داهێزان چوون. دواتریش تورکە عوسمانییەکان گەرانەوە سەر رەچەڵەکەکەی خۆیان و لەژێر پەردەی ئیسلامدا کەوتنە پەلاماردان و وێرانکردنی ولاتانی دەوروبەر و ولاتانی ئەورووپا و لە ناوبردنی کولتوور و شارستانییەکەیان. بۆیە گەلی تورک ئەگەر سەروەرییەکی مێژوویی هەبێ شانازی پێوە بکرێ، ئەوا ئەو سەروەرییەی لە رێگەی ئاینی ئیسلام و، بگرە لە رێگەی

زەوتکردنی دەسەلاتی خەلافەتی ئیسلامەوە بۆ هاتووە.

بەلام لە ئیراندا هەرچەندە لەشکری عەرەبی ئیسلامی توانی دەولەتی داهێزراوی ساسانییەکان بڕوخێنێ و، لەم ڕێگەیەشەوە ئایینی زەردەشتی تێکبشکێنێ، بەلام نەیتوانی ڕیشەی قوولی ئەم ئایینە لە فیکر و ویژدان و ڕۆحی ئێرانییەکاندا هەلبکەنێ. بۆیە ئایینی ئیسلام، وەک دیاردەیەکی فیکری- ڕۆحی زیاتر لە سەتحی سەرەوەی هۆشیاری خەلکی ئێراندا مایەوە و نەیتوانی بە قوولی لە ویژدان و دەروونیاندا بچەسپێ.

هەروا کولتووری ساوای عەرەبی ئیسلامی، کە بە سەرجەمی کولتوور و فیکر و زمان و شارستانیی خەلکی ئێران نامۆبوو، زۆر لەوە لاوازتر بوو کە بتوانێ بە ئاسانی جێگە بە کولتوور و شارستانیی دێرینی ئێرانییەکان لەق بکات و لەناوی بەرێت. بە تایبەتی ئەوان دەولەتی خۆیان هەبوو، وەک گەلی کورد نەبوون ژێردەستەی دەولەتێکی بێگانە بن و، پێش پەلاماردانی ئیسلام کولتوور و شارستانییەکەیان پەلامار درابێ. بۆیە بە درێژایی ئەو سالانەی لەشکری عەرەبی ئیسلام ئێرانی داگیرکرد بوو. ئێران ئارامی بە خۆیەوە نەدی.[٦١] کێشەی نێوان خەلکی ئێران و دەسەلاتی عەرەبی ئیسلامی، کە شێوەی بەرەنگاری توند و تیژی وەرگرتبوو، تەنیا کێشەیەکی ئایینی نەبوو، بەلکو لە هەمان کاتدا کێشەی نێوان دوو جۆرە شارستانی و دوو چەشنە کولتوور و داب و نەریتی نەتەوەیی بوو.

هەروا ئێرانییەکان چالاکانە لە زۆربەی بزوتنەوە مەزهەبییە- کۆمەلایەتییەکانی دژ بە خەلافەتی عەرەبی ئیسلامی وەک بزوتنەوەی

خەوارج، قەرامیتەکان، ئیسماعیلیەکان و... هتد بەشدارییان کرد. ناوەرۆکی فیکری- کۆمەلایەتی ئەم بزوتنەوانە هەرچییەک بووبێ، ئەوا بەشداربوونی ئێرانییەکان رەنگە زیاتر بە ئامانجی خۆدەربازکردن لە دەسەلاتی عەرەبی ئیسلامی بووبێ.

کاتێ مەزهەبی شیعە کە ریشەیەکی عەرەبی هەبوو وەک ئەلتێرناتیڤێکی فیکری مەزهەبی رەسمی سوننە سەری هەلدا، ئەوا هەر زوو لەنێو ئێراندا تەشەنەی کرد و، چەند سەدە بەر لە سەفەویەکان وەک بارتولد دەنووسێ ئایدۆلۆژیای بزوتنەوەی خەلکی ئێران بوو.[7]

دواتریش کاتێ تورکە سەفەوییەکان، لە سەرەتای سەدەی شانزەیەمدا دەولەتی ناوەندی ئێرانیان دامەزراندەوە، مەزهەبی شیعەیان لە بەرامبەری، یان دروستتر بلێین لە دژی مەزهەبی سوننەی خەلافەتی ئیسلامی، کردە مەزهەبی رەسمی دەولەتەکەیان و، وەک ئیمپراتۆری، یان ناوەندێکی تری ئیسلامی کەوتنە پەلاماردانی ناوچەکانی دەوروپشتیان.

پەیرەوکردنی مەزهەبی شیعە بۆ ئێرانییەکان تەنیا ئینتیمایەکی مەزهەبی- فیکری نەبوو، بەلکو هەلگەرانەوەیەکی فیکری- کولتووری و نەتەوەییش بوو لە خەلافەتی ئیسلام کە وەک دەسەلاتێکی بێگانە و نامۆ سەیردەکرا. بۆیە دەشێ وەرگرتن و چەسپانی شیعیزم لە ئێراندا وەک پرۆسەیەکی سەرلەنوێ دروستبوونەوەی یەکێتی ژیانی رۆحی دابنرێ، کە بە هۆیەوە توانیبیان بە تەواوی و تاسەر خۆیان لە یەکێتی ژیانی رۆحی گەلانی تری ئیمپراتۆری ئیسلامی (عەرەبی و دواتر عوسمانی) جودا بکەنەوە و،

ئازادانە ژیانی نەتەوەیی- کولتووری خۆیان گەشەپێبدەن.

لە ئەنجامی ئەمانەدا، هەر زوو پێکدادانێکی گەورە لە نێوان جووتە ئیمپراتۆری ئیسلامی سوونی- شیعی، یان عوسمانی و ئێرانی ڕوویدا، ئەمجارەشیان زەبری پشتشکێن هەربەر گەلی کورد کەوت، بەڵام ئەمجارەیان لەلایەن لەشکری ئیسلامەوە نەبوو، بەڵکو بە هێزی خودی ئایینی ئیسلامەوە بوو. چونکە زۆربەی گەلی کورد لەبەر ئەوەی سوونی بوون پشتی ئیمپراتۆری عوسمانییان گرت[٨] و لە ئەنجامدا تورکە عوسمانییەکان بە کۆمەکی کورد سەرکەوتن و بەشی هەرە گەورەی کوردستان کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانی. ئەمەش گەورەترین کارەساتێکی مێژوویی بوو کە لە دوای هاتنی لەشکری ئیسلامەوە بەسەر گەلەکەماندا هات و تا ئەمڕۆش لێی دەرباز نەبووە.

ڕۆڵ و حەماسی کوردان لە شەڕی چاڵدران و (ئەبەردیبەکانی) تری ئیمپراتۆری عوسمانییدا دەریان خست کە گەلی کورد تا چ ئەندازەیەک بە کولتوور و مێژوو ژیانی نەتەوەیی خۆی نامۆ کراوە؟!... تا چ رادەیەک ئایینی ئیسلام لە ڕووی رۆحییەوە بە ئیمپراتۆری عوسمانییەوە گرێیداوە!...

تواندنەوەی فیکری گەلی کورد لە نێو ئایدۆلۆژیای ئیسلامدا، ئەو ئایدۆلۆژییەی وەک دوکتۆر حوسێن مرووە دەڵێ بەرهەمی کۆمەڵی سەرەتایی بوو لە دواپلەی داهێزانیدا، یاخود توانەوەی رۆحی گەلی کورد لەنێو ئایینی ئیسلامدا، گیانی خۆناسینی نەتەوەیی و هەستی نەتەوەیی لای کورد بەرادەیەک داتەپاند کە سنوورێک لەنێوان خۆی و لە نێوان (برادینیە) داگیرکەرەکانیدا نەبینێ. بە واتایەکی تر

ئایدیۆلۆژیای ئیسلام، وەک ئایینی هاوبەشی گەلە مسوڵمانەکانی کوردستان جۆرە یەکبوون، یان یەکیەتییەکی فیکری- رۆحی بەسەر گەلی کوردستاندا سەپاند کە لەناوەرۆکدا جگە لە ویرانکردنی ژیانی نەتەوەیی و کۆیلەبوونی گەلی کورد و سەرداربوونی ئەو گەلانەی تر شتێکی دیکە نەبوو. خەڵکی کوردستان بە هێزی ئەم هۆشیارییە ئیسلامییەوە، یان بە هێزی ئەم یەکیەتییە رۆحییە ئایینییەوە بە مێژووی خۆیان نامۆکران و هەستی خۆناسینی نەتەوەییان داتەپێندرا، لە ئەنجامدا نەیانتوانی بە درێژایی چەند سەدەیەک، دەرک بەو جیاوازییە چۆنایەتییە بکەن کە ئەمان لە داگیرکەرانی وڵاتەکەیان جودا دەکاتەوە. مەگەر جارویار بلیمەتانی بە دەگمەن هەڵکەوتووی وەک خانی هێندە زوو دەرکیان بەم کارەساتە کردبێ و بەدەم ژان و سرتانەوە بانگی یەکێتی نەتەوەیی و خۆناسیتی نەتەوەیی و سەربەخۆییان دابێ، بێ ئەوەی خەڵکە بە ئەفیون بەنج کراوە کە لە ناوەرۆکی فەرموودەکانیان بگەن.

دەشێ لە روانگەی ئەم بە خۆنامۆبوونە نەتەوەیی و گومراییە مێژووییەوە لە بەشداری هێزە کوردەکان لە کوشتاری ئەرمەنەکان و لەشەری گریکەکان و لەوەش زیاتر قەتلوعامی یەزیدی و عەلەوییە (کافرەکانی) کوردستانی باکوور بە دەستی کوردە فەنەتیکە مسوڵمانەکان تێبگەین.

بەکورتی گەلی کورد چونکە یەکیەتییەکی رۆحی- ئایینی سەربەخۆی نەبوو کە لە داگیرکەرانی عەرەبی ئیسلامی و عوسمانی و ئیرانی جودای بکاتەوە، ئەوا تەنیا لە رێگەی خۆناسینی نەتەوەیی و هۆشیاری نەتەوەییەوە دەیتوانی و دەبوو دەرک بە جیاوازی و

سەربەخۆیی نەتەوەیی خۆی بکات و لە سروشتی داگیرکەراتی ئەو دەوڵەتە گوایا ئیسلامییانە تێبگات و بخەبتێ بۆ رزگاربوون لە کۆیلایەتی عەرەب و تورک و فارس.

خەباتی گەلانی ژێردەست بۆ رزگاربوونی نەتەوەیی و سەربەخۆیی زیاتر دوو شێوەی بە خۆگرتووە، یان هۆکاری ئایینی، واتا جیاوازی رۆحی- ئایینی نێوان نەتەوەی سەردەستە و داگیرکەر و نەتەوەی ژێردەستە رۆڵی سەرەکی دیوە (بۆ نموونە رۆڵی کڵێسا و ئایینی عیسایی لە خەباتی گەلانی بولگارستان و یوگوسلاڤیا و... هتد بۆ رزگاربوون لە ئیمپراتۆری ئیسلامی عوسمانی، هەروا رۆڵی ئایینی ئیسلام لە خەباتی گەلانی عەرەبی میسر [9]وجەزایر وتونس و مەغریب بۆ رزگاربوون لە (کافرە) کۆلۆنیالیستەکان.

یان ئەم خەباتە ئەنجامی گەشەکردن و بڵاوبوونەوەی هەستی نەتەوەیی و هۆشیاری نەتەوەیی و دەرکەوتنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی بووە.

بەلاّم لەبەر ئەوەی گەلی کورد، لە رووی ئایینی- رۆحییەوە بە داگیرکەرە یەک لە دوای یەکەکانی کوردستانەوە گرێدرا، ئەوا ئایینی باو لە کوردستاندا نەک هەر رۆڵێکی لە خۆناسینی گەلی کورددا نەبینی، بەڵکو ئەم گەلەی بە خۆی و مێژوو و کولتوور و سەرجەمی ژیانە نەتەوەییەکەی نامۆکرد. بۆیە توانرا بە ئاسانی گەلی کورد، وەک بەهەشتی عەلادین سەجادی دەڵێ، بکرێتە بەردی قۆچەقانی بەم و بەودا بدرێ، یان وەک دووبەردی هەڵمات بەیەکدا بدرێ.(10)

بۆیە دەبوایە خەباتی نەتەوەی کورد بۆ سەربەخۆیی و رزگاری تەنیا

له‌ ڕێگه‌ی بڵاوبوونه‌وه‌ی هه‌ست و هۆشیاری نه‌ته‌وه‌یی و ده‌رکه‌وتنی بزووتنه‌وه‌ی ڕزگاریخوازی کورد، وه‌ک دیارده‌یه‌کی مێژوویی سه‌رهه‌ڵیدات.

لام وایه‌ ئه‌نجامی ئه‌م هۆکاره‌ مێژووییه‌ بێ که‌ ئیسلام وه‌ک بزووتنه‌وه‌ی سیاسی له‌ کوردستاندا، ده‌رنه‌که‌وتووه‌ و تائێمرۆ له‌نێو بزووتنه‌وه‌ی ڕزگاریخوازی نیشتمانی کوردستاندا، به‌ پێچه‌وانه‌ی بۆ نموونه‌ بزووتنه‌وه‌ی گه‌لی فه‌له‌ستین، هیچ هێز و ڕێکخراوێکی سیاسی ئایینی ده‌رنه‌که‌وتووه‌. وا ده‌زانم کوردستان وه‌ک وڵاتێک که‌ ژێرده‌سته‌ی نه‌ته‌وه‌ و ده‌وڵه‌تی غه‌یره‌ ئیسلامی نییه‌، زه‌مینه‌یه‌کی له‌بار نه‌بێ بۆ سه‌رهه‌ڵدانی بزووتنه‌وه‌ی سیاسیی ئیسلامی و گه‌شه‌کردنی، مه‌گه‌ر هۆکاری ده‌ره‌کی یارمه‌تی بدات.

ده‌رکه‌وتنی بزووتنه‌وه‌ی ڕزگاریخوازی کوردستان، قۆناغێکی سه‌رجه‌م نوێیه‌ له‌ مێژووی نه‌ته‌وه‌که‌ماندا، که‌ ده‌شێ به‌ قۆناغی بێداربوونه‌وه‌ی ژیانی نه‌ته‌وه‌یی ناوبه‌رین. هه‌روا ئه‌م بزووتنه‌وه‌یه‌ له‌ بنچینه‌دا به‌رهه‌می سروشتی ناکۆکی بابه‌تییانه‌ی نێوان نه‌ته‌وه‌ی کورد و ده‌سه‌ڵاتی چه‌وسێنه‌ری نه‌ته‌وه‌ داگیرکه‌ره‌کانی کوردستانه‌. ئامانج و په‌یامه‌ مێژووییه‌که‌یشی نه‌هێشتنی ئه‌م ناکۆکییه‌ و گه‌یاندنی نه‌ته‌وه‌ی کورده‌ به‌ ڕزگاربوون و سه‌ربه‌خۆیی نیشتمانی، وه‌ک له‌ به‌شه‌کانی تردا باسی ده‌که‌ین.

# سەرچاوە و پەراوێزەکان

١- بڕوانە: أدونیس، الثابت والمتحول، بحث في الاتباع والابداع عند العرب، الجزء الاول، طبعه ثالثه منقحه، دار العودة، بيروت ١٩٨١ ل١٦.

٢- بۆ زیاتر لەم ڕووەوە بڕوانە: د. حسين مروه، النزعات المادية في الفلسفه العربيه الاسلاميه، دار الفارابي، بيروت ١٩٧٩ (دوو جلد).

٣- هەندێ لە نووسەرانی کورد لایان وایە کە ئەو ئەدەبەی بە زمانی ئاڤێستا و پەهلەوی نووسراون دەشێ بە ئەدەبی کوردی پێش ئیسلام دابنرێن. چونکە ئەم دوو زمانە هێندەی لە فارسی ئێستاوە لە زمانی کوردیشەوە نزیکن. بەڵام ئەم رایەهێنشتا پێویستی بە لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی زانستی هەیە.

بۆ زیاتر لەم ڕووەوە بڕوانە:

- ئەمین موتابچی، شاعیرانی کورد و ئەدەبی فارسی، گۆڤاری کۆلێجی ئاداب ژمارە (١٦) بەغدا ١٩٧٣ ل٥. وەرگیراوە لە: الدكتور عزالدين مصطفى رسول، احمدى خانى شاعرا ومفكرا، بغداد. ١٩٧٩ ل٩١.

٤- بەپێی سوورەی (ئەنفال) ئایەتی ٤١، ٦٩ لەشکری عەرەبی ئیسلام هەرچی دەسکەوت و تالانیکیان لە شەڕەکانیاندا چنگ دەکەوت دەیانتوانی لەنێو خۆیاندا دابەشی بکەن.

هەروا بەپێی سوورەی (النساء) ئایەتی (٢٤) شەڕکەرە سەرکەوتووە موسڵمانەکان هەقی ئەوەیان هەبوو ژنی کوژراوە کافرەکان لە خۆیان مارەبکەن.

٥- بڕوانە: عبدالقادر ابن رستم باباني، سير الاكراد، سەرچاوەی ناوبراو ل٣٩.

* ڕەشاد میران- لە نامەیەکی تایبەتیدا کە هەندێ تێبینی سەبارەت بەم باسە بۆ نووسیبووم.

٦- بۆ زیاتر دەربارەی داکۆکی ئێرانییەکان بڕوانە عەلی میر فیترووس ئیسلام

ناسی سیاسەکی پاپەک کردوبە بە کوردی. ١٩٨٧ ل٦٧ و دواتر.

٧- طبری: برخی بررسیها درباره جیهان بینی هاو جنبش های اجتماعی در ایران، چاپ دوم، ١٣٦١ ل١٤٤.

٨- شەهید عەبدولڕەحمانی قاسملو لەم بارەوە دەنووسێ:

(سولتان سەلیمی عوسمانی بە کەلک وەرگرتن لە هەستی ئایینی، کوردە سوننیەکانی لە دژی سەفەویەکان هان دا و بەم جۆرە تورکەکان بە یارمەتی کوردەکان توانیان لەشکری چالدراندا کە ٢٣ تروتی سالی ١٥٢٤ لە شیمالی رۆژئاوای گۆلی ورمێ روویدا لەشکری شاسمایل بشکێنن. بڕوانە: دوکتور عبدالرحمن قاسملو، کوردستان و کورد، وەرگێڕ عبدالله حسن زادە ١٩٧٣، ل٤٢.

٩- بۆ نموونە لە میسردا مەڵبەندی ئایینی (الازهر) بووە یەکێ لە مەڵبەندەکانی شۆڕشی ١٩١٩ی میسر، یان وەک نووسەری ناسراوی عەرەب سەلاح عیسا دەڵێ: ئەم مەڵبەندە ئایینیە بەرەنگاربوونەوەی دژ بە قەرەنسایبەکانی سەرکردایەتی دەکرد. بڕوانە گۆڤاری (النهج) مرکز الابحاث والدراسات الاشتراکیە في العالم العربي- العدد (٢٥) ١٩٨٩ ل١٨.

١٠- علاءالدین سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی- بەغدا ١٩٥٢ ل٦٢.

بەشی سێیەم:

# کولتووری جەنگەڵ
# یان
# کولتووری گەل؟

ئەگەرچی جیاوازییەکی چۆنایەتی لەنێوان ناوەرۆک و پەیامی تایبەتەکان و ناوەرۆکی شۆڕشە کۆمەلایەتییەکاندا بووە، بەڵام هەردوو دیاردەکە لە ڕووی هەژاندنی کۆمەڵگاو و ڕووکردنە مرۆڤ، وەک هۆکار و ئامانج تارادەیەکی زۆر، لە یەکتری چوون. هەروا هەردوو دیاردەکە سیستەمێکی فیکری- کولتووری ترییان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە و ڕیستوویانە کولتووره باوەکە، وەک بیروبۆچوون و مۆراڵ و داب و نەریت و...... هتد، کە بەرهەمی مێژوونێکی تر بووە، ڕامالن و لە جێگەیدا کولتوورێکی نوێ بچەسپێنن، تا بە هۆیەوە بناخەی کەسایەتی و سایکۆلۆژیای مرۆڤەکانی کۆمەڵگا دابڕێژنەوە.

بەڵام بەو پێیەی ئەم دیاردانە لە مرۆڤەوە دەستیان پێکردووە و، مرۆڤ لەیەک کاتدا ئامراز و ئامانج بووە، ئەوا خودی مرۆڤ، وەک بەرهەمی مێژوویەکی دیاریکراو بۆتە مەیدانی کێشەی نێوان ڕەگەزە جۆربەجۆرەکانی هەردوو کولتووره کۆن و نوێیەکە. پێدەچێ لە

پرۆسەی ئەم کێشەیەدا ئەوەندەی ئایین و شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکان ویستوویانە مرۆڤ بگۆڕن هێندەیش مرۆڤ، وەک بەرهەمی مێژوو و کولتوورێکی دیاریکراو، ویستوویەتی ناوەرۆکی ئایین و شۆڕشەکان بگۆڕێ. سەرکەوتنی تائینستای مرۆڤ بەسەر ئەم دیاردە مێژووییانەدا زیاتر سەرکەوتنی کولتووری باو بووە، کە پەیوەچێ بە ئەندازەیەک ڕیشەی لە کەسایەتی و سایکۆلۆژیای مرۆڤەکانی ئەو کۆمەڵگایانەدا داکوتابێ، کە بە ئاسانی هەڵنەکەندرابێت.

بۆ نموونە ئایینی ئیسلام، وەک لەبەشی پێشوودا باسکرا، کۆمەڵێک بیروبۆچوون و تەریتی ئینسانی هێنا کە بە هۆیانەوە گۆڕانێکی گەورەی کۆمەڵایەتی و فیکری و سیاسیی لە کۆمەڵگای دوورگەی عەرەبدا خوڵقاند. بەڵام کولتوور و داب و نەریتی سەدان ساڵەی خەڵکی جاهیلی دوورگەی عەرەب هێندە بە ئاسانی لەنێو نەبران، بۆیە ئەم پرۆسەی گۆڕانکارییانە تاسەر درێژەی نەبوو. هەروا ناوەرۆکی نوێ و ئینسانیی ئیسلام نەیتوانی کولتوور و کەسایەتی و سایکۆلۆژیای مرۆڤی عەرەب بە تەواوی بگۆڕێ. ئەو مرۆڤە جاهیلییە ڕەفتار بە دەوییەی دوێنێ کڕنوشی بۆ یەکێک لە بتە زەبەندەکان دەبرد، لەوەرگرتنی ئیسلامدا زیاتر نێو و شێوەی خوداوەندەکەی خۆی گۆڕی نەک کولتوور و داب و نەریتی دیرینی خۆی.

ئایینی ئیسلام دیاردە کۆمەڵایەتییە چەوتەکانی وەک تاڵان و ژن فرۆشی و زیندەبەچاڵکردنی کچان و دزی و پەلاماردانی خێڵەکی و ناوچەگەری و.....هتد یاساغکردن و بۆ هاوەیەکیش ڕێگەی لێگرتن، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم دیاردانە بەشێک بوون لە کولتوور و داب و نەریتی باوی ئەو سەردەمەی دوورگەی عەرەب و، لای ئەوان وەک

غەریزەی لێهاتبوو، ئەوا ئاینی ئیسلام نەیتوانی تاسەر هەموو ئەم دیاردانە ریشەکێش بکات.

رەنگە لەو سەردەمەدا کێشەی نێوان بیرو ئایدیالْ و ناوەرۆکی نوێی ئیسلام و نێوان بیر و ئایدیالْ و کولتووری جاهیلی، کەسایەتی زۆربەی خەڵکی تازە مسوڵمانی عەرەبی تەنیبێتەوە. بە واتایەکی تر، مرۆڤی تازە مسوڵمانی دورگەی عەرەب بوبێتە مەیدانی کێشە و پێکدادانی هەردوو بیر و تەریت و کولتووری کۆن و نوێیەکە...... جاهیلی و ئیسلامییەکە... بەربەری و ئینسانییەکە. چونکە ئەوەندەی ئیسلام وەک سیستمێکی رۆحیی- فیکریی دەیویست کەسایەتی و سایکۆلۆژیای مرۆڤی جاهیلی بگۆڕیْ و، لەسەر بنچینەی فیکر و ناوەرۆکی ئاینی ئیسلام کەسایەتییەکی نوێی لیْ دروست بکاتەوە، هێندەیش سیستمی کۆنی فیکریی و کولتووری دورگەی عەرەب دەیویست لەنێو کەسایەتی مرۆڤەکاندا پارێزگاری خۆی بکات و وەک بیر و ئایدیالْ و کولتووری چەسپاو بمێنێتەوە. لێرەدا مرۆڤ وەک چۆن ئامرازی بەردەوام بوونی کێشەی نێوان هەردوو سیستمەکە بووە بە هەمان شێوەیش ئامانجی دوو سیستمەکە بووە.

ئەم دیاردەیە لەو کۆمەڵگایانەیشدا کە شۆڕشی گەورەی کۆمەلایەتییان بە خۆیانەوە دیوە سەری هەڵداوە. کاتیْ لە پرۆسەی سەرکەوتنی شۆڕشەکان و کێشەی نێوان دوو جۆرە کولتووردا، کولتووری کۆنەکە درێژەی بە خۆی داوە، یان گەلیْ لە رەگەزە سەرەکییەکانی خۆی لەگەڵ باروودۆخە نوێیەکەدا گونجاندوون و، تەبایی و پێکەوە هەڵکردنێکی سەیر لەنێوان دوو جۆرە کولتووری پێک ناکۆکدا دروست بووە، کە لە ئەنجامدا زۆربەی مرۆڤەکانی کۆمەڵگا

ڕەگەز و لایەنەکانی هەردوو جۆرە کولتوورییان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتووە و، بەپێی باروودۆخی بابەتی و لە ڕوانگەی بەرژەوەندیی تایبەتی و کۆمەڵایەتیی خۆیانەوە، ئەم شێوە کولتوورە، یان ئەوی تریان پەیڕەو کردووە. ئاشکرایشە کە دەسەڵاتی سیاسی، بەردەوام گیانی خۆپەرستی و دەسەڵاتپەرستی لای مرۆڤ دەهەژێنێ. هەروا میکانیزمی دەسەڵات پاراستن و مەزنخوازی پێویستی بەسەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی کولتووری نێگەتیڤ و داپلۆسێنەرانە هەیە.

بۆ نموونە شۆڕشی بۆرژوازی فەرەنسا و ڕۆژئاوا لە بنەڕەتدا بە ناوی برایەتی و یەکسانی و دادپەروەرییەوە سەریان هەڵدا، بەو ئامانجەی کۆمەڵگای دارزاوی پێشوو هەڵتەکێنن و، لە جێگەیدا کۆمەڵگایەکی دادپەروەرانە دابمەزرێنن. بە هەمان شێوە شۆڕشی ئۆکتۆبەر کۆششێکی گەورە بوو بۆ نەهێشتنی چەوساندنەوەی چینایەتی و نەتەوایەتی و دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی دادپەروەرانە. بەڵام لە ئەنجامدا هەموو ئەم شۆڕشانە نەک هەر نەیانتوانی ناوەڕۆک و کولتوور و ئامانجی دادپەروەرانەی خۆیان لە کۆمەڵگادا بچەسپێنن، بەڵکو لە سایەیاندا و بە ناوی پەیامە ئینسانییەکانییانەوە گەورەترین تاوان و کاری نا ئینسانییانە کران. پێم وایە بەشێکی گەورەی تراژیدیای شۆڕشە فیکریی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، لەپێش ئیسلامەوە تائێستا لەوەدایە کە لەگەڵ ڕامالینی سیستم و دەسەڵاتی کۆنی سیاسی و ئابووریدا ناتوانرێ بە هەمان شێوە ژیانی ڕۆحیی و فیکریی و کولتووری کۆمەڵگا و، کەسایەتی و سایکۆلۆژیای مرۆڤەکانی بێنە گۆڕین. بەڵکو کولتوور و داب و نەریتە باوەکان، کە ڕیشەی قووڵیان لەنێو مرۆڤ و کۆمەڵگادا هەیە درێژە بەکارتێکردنی خۆیان دەدەن.

ئەوەتا زۆربەی ئەسحابە گیانفیدا و لە خزمەردەرەکان بوونە بازرگان و کۆیلەدار و جەللاد و مولکداری سەردەمی خۆیان. شۆرشگێراتی فەرەنسا و رۆژئاوا و سۆڤیەت کاتێ دەسەڵاتی سیاسییان گرتە دەست دوای ماوەیەک جێگەی پیاوکوژانی پێشوویان گرتەوە و هەمان میتزە و داب و نەریت و کولتووری تێکەتیڤانەی پێشوویان لە فۆرمێکی نوێدا هێنایەوە بەرهەم.

ئاخۆ لایەنی ئینسانی ئایینی ئیسلام تا چ ئەندازەیەک مرۆڤی دوورگەی عەرەب و، دواتریش خەڵکی فارس و تورک و هی تری گۆڕی؟ یان مرۆڤەکانی ئەو کۆمەڵگایانە، کە بەرهەمی مێژوو و کولتوورێکی تایبەتی بوون تا چەند تاوەرزک و بەهای ئیسلامیان گۆڕی و ملکەچی بەرژەوەندی خۆیانیان کرد؟

ئاشکرایە هۆز و تیرەکانی دوورگەی عەرەب، بە درێژایی سەدان ساڵ بە ئەندازەیەک سەرقاڵی پەلاماردان و یەکتر کوشتن بوون کە ئەم کولتوور و نەریتە لای ئەوان وەک پیشە و غەریزەی لێهاتبوو. کاتێ ئەوان لەژێر سایەی دەسەڵاتی سیاسیی ئیسلامدا کۆبوونەوە ئاسان نەبووە دەستبەرداری ئەم کولتوور و پیشە رەسەنەیان بن. ئەوان دەسەڵاتی گەشەسەندووی ئیسلامیان کردە هۆکارێکی نوێ بۆ درێژەدان بە پیشە و نەریتی پەلاماردەرانەیان. بە تایبەتی کە ئەوان لەگەڵ هەر شاڵاوێکی نوێدا سامان و تاڵان و دەسکەوتێکی زۆریان دەست دەکەوت.

بە کورتی پێم وایە ئایینی ئیسلام نەک هەر نەیتوانی ئەم کولتوور و پیشەیەی خەڵکی دوورگەی عەرەب بگۆڕێ، بەڵکو هەمان نەریت و کولتوور لەژێر سایەی ئیسلام و ئەمجارەیان بە نێوی ئیسلامەوە

دریژەیان بە خۆیان دا و بوونە میتۆدی سەرەکی دەسەڵاتی عەرەبی ئیسلامی. بگرە لەو سەردەمەدا هەندێ تێکستی نوێی ئایینی دەرکەوتن کە بەزەقی شوێنەواری ئەم کولتوورەیان پێوە دیارە و پاکانە بۆ هەندێ کرداری نارەوا دەکەن.

لێرەدا دەسەڵاتی سیاسیی دەوڵەتی ئیسلام، کە لە چنگی بازرگانە دەوڵەمەند و موڵکدارەکاندا کۆببۆوە، مەحاڵ بوو لەیەک کاتدا بتوانێ درێژە بە داگیرکردنی وڵاتانی تر بدات. کەچی پشت لە کولتووری تێگەتێڤانەی کۆنی عەرەب بکات و، ناوەرۆکی ئینسانی و دادپەروەرانەی ئیسلام، کە دژی پەلامار و کوشتن و تاڵان بوو، بچەسپێنێ. چونکە پرۆسەی داگیرکردن و مەزنخوازیی عەرەب پێویستی بە زلترین شێوەی زەبروزەنگ و داپلۆسین و ملهوڕی هەبوو. بە تایبەتی کە لەشکری عەرەب لەپاڵ داگیرکردنی سیاسی و ئابووری وڵاتانی تردا، دەبویست سیستمی فیکری و ئایینی گەلانی ژێردەستە لەناوبەرێ و لە جێگەیدا سیستمێکی تری فیکری و رۆحی بسەپێنێ. ئەم کارە سەختەش پێویستی بە بەرهەمهێنانەوەی کولتووری داپلۆسینەرانە و میتۆد و نەریتی زاڵمانە هەبوو. لە هیچ حاڵێکیشدا بە هانەی بڵاوکردنەوەی ئیسلام و بە مسوڵمانکردنی زۆرەملێیانەی گەلانی تر، ناتوانێ پاکانەی ئایینی و ئەخلاقی بۆ پرۆسەی فتوحات بکات. چونکە ئەگەر ئایینە ئاسمانییەکان یەک چارگەیان هەبێ و، پێغەمبەرانییان لەلایەن یەک خوداوەندەوە نێردرابن، ئەوا سەپاندنی زۆرە ملێیانەی ئایینێک لە جێگەی ئایینێکی تر کارێکی نارەوایە و، ناتوانرێ پاکانەی بۆ بکرێ.

ئاشکرایە زەوتکردنی کیژ و ئافرەت و هەراجکردنی زارۆک و ژنان

لەگەڵ ناوەرۆکی دادپەروەرانە و مرۆڤدۆستانەی ئیسلامدا نەدەگونجان.
بەڵام کاتێ لەشکری عەرەبی ئیسلامی لەشەری نەهاوەندا سەرکەوتن ژمارەیەکی یەکجار زۆریان لە ژنان و کچان و منداڵانی بە دیل گرتن و هەموویان لە بازاری (مەدینە)دا فرۆشتن و ناوی (وسپانا) و (ئوسرا)یان لێ نان.[1]

لەوەیش زیاتر لە دوای کوژرانی ئیمامی عەلی و سەرکەوتنی لایالی مەعاویە، هەموو ژنانی ئەو مسوڵمانانەی لەنێو شاری مەدینەدا، کە شاری خودی پێغەمبەر بوو لایەنگری عەلی بوون زەوت کران و دەستدرێژی کرایە سەر ناموسیان.[2] هەر لە هەمان سەردەمدا ژنانی شاری کوردنشینی هەمەدان، بەدیل بران و لە بازارەکاندا هەراج کران. ئەم ژنە کوردانە وەک بروکلمان دەنووسێ: (هەوەڵین ئافرەتی مسوڵمان بوون کە لە سەردەمی ئیسلامدا هەراج بکرێن و خەڵکی بیان کڕێت).[3]

ئایا لەشکری عەرەب، بەپێی پەیام و ناوەرۆکی ئیسلام ئەم کارەیان ئەنجام دەدا؟! یان بەپێی کولتوور و داب و نەریت و مۆراڵی دێرینی عەرەب؟!

عەرەبە بەدەوییە تازە مسوڵمان بووەکان، کە هەڵگری هەمان کولتووری داپلۆسینەرانەی پێشووی خۆیان بوون، بە ناوی فتوحات و گەیاندنی پەیامی ئیسلام بە جیهان، کەوتنە پەلامار و داگیرکردنی وڵاتانی دەوروبەریان. بە رای من ئەوان بە تەنیا ئایینی ئیسلامیان لەنێو گەلان و وڵاتانی تردا نەچەسپاند، بەڵکو لەهەمان کاتدا داب و نەریت و مۆراڵ و سەرجەمی کولتووری تێکەتێڤانەی خۆیشیان سەپاند.

رەنگە رێکەوتێکی سەیربێ کە گەلێ ڕەگەز و لایەنی ئەو داب و نەریت و کولتوورە نێگەتیڤەی لای خەڵکی عەرەب چەسپابوون، لای ساسانییەکان و هۆزە تورکە شەرفرۆشەکانیش باو بوون. بۆ نموونە: هۆزە تورکەکان، بەر لەوەرگرتنی ئایینی ئیسلام خودانی مێژوویەکی دوورودرێژی پەلاماردان و وێرانکردنی وڵاتانی تر بوون. هەروا ئیمپراتۆریی ساسانی بەزەبری سەرپەراندن و کۆیلەکردنی خەڵکی تر دامەزرابوو. ئەم دیاردەیە پرۆسەی تێکەڵبوون و (لێک مارەکردنی) کولتوور و داب و نەریتی نێگەتیڤی عەرەب و، کولتوور و داب و نەریتی نێگەتیڤی ساسانی و تورکەکانی ئاسانتر کرد. ئاخۆ ئەوان کام لایەنی پێشکەوتوو و کام ناوەرۆکی ئینسانی ئیسلامیان لە لەشکری عەرەب وەرگرت و لەنێو کۆمەڵگاکەی خۆیاندا پەیڕەویان کرد؟!

لام وایە ئەوان ئیسلامیان زیاتر وەک لایەنە ئەنترۆپۆلۆژییەکەی، واتا وەک شێوەی پیادەکردنی لەلایەن لەشکری عەرەبی ئیسلامییەوە، پێنگەیشت نەک وەک پەیامێکی رۆحیی- ئینسانی. بۆیە ئەگەر ئەوان بەناوەرۆکی ئایینەکە و گەلێ لایەنی کولتووری عەرەبی نامۆ بووبن، ئەوا بە گەلێ لایەنی تری ئەم کولتوورە نێگەتیڤەی عەرەب ئاشنا بوون.

ئایینی ئیسلام کاتێ لە دوورگەی عەرەبدا، کە جاوگەی سەرهەڵدانی بوو، نەیتوانی نەریت و مۆراڵ و کولتووری داپلۆسێنەرانەی عەرەبی جاهیلی ریشەکێش بکات،ئاسان نەبوو، بگرە مەحاڵ بوو بتوانێ لە کۆمەڵگای ئێرانی و لەنێو تورک و گەلانی تریشدا داب و مۆراڵ و کولتووری نێگەتیڤانە لەناو بەرێت و، لەسەر بنچینەی ناوەرۆکی ئایینی ئیسلام کولتوور و نەریت و کەسایەتی نوێ دابمەزرێنێ. لە

ئەنجامدا هەردوو گەل بە ناوی ئیسلامەوە درێژەیان بە ھێرشی پەلاماردەرانەیان دا، دواتر وەک دوو ئیمپراتۆری مەزنخواز کەوتنەوە کوشتاری گەلانی تر، ئەوەی لەشکری عەرەبی بەوانی کردبوو، ئەوان بە زیادەوە بە گەلانی تر. لەپێش هەمووانندا، بە گەلی کوردیان کرد. لەم کارەشیاندا بەر لە هەموو شتێک پشتیان بە کولتووری نێگەتیڤانەی خۆیان، نەک بە ناوەرۆکی ئینسانی و دادپەروەرانەی ئیسلام، بەست کە وەک پێداویستییەکی حەیاتی هێنایانەوە بەرهەم.

لام وایە کولتووری نێگەتیڤانەی هەرسێ ئیمپراتۆری عەرەبی، فارسی و تورکی بەردی بناغەی تیرۆری ئاسیایی و سێ سوچکەی کولتووری داپلۆسێنەرانەی ئاسیایان چەسپاند.

ئێمە بە درێژایی سەدان ساڵ لەنێو چەرگەی دۆزەخێکدا ژیاوین کە سێ ئیمپراتۆری ملهوڕ لە سەرجەمی رۆژهەلاتدا نابوویانەوە. کوردستان کە لە نێو چەرگەی هەر سێ ئیمپراتۆرییەکەدا بووە و گەلێ جار بۆتە چەپەری نێوانیان، بە درێژایی سەدان ساڵ ئاماجی پەلاماری ئەم ئیمپراتۆرییانە و مەیدانی جەنگی درندانەی نێوانیان بووە. هەرکامیان جەنگەکەی بردبێتەوە ئێمە جگە لە ماڵوێرانی و کاولبوونی شار و ژیانمان شتێکی ترمان پێنەبڕاوە. لەهەمان کاتدا کوردستان شوێنی تەراتێن و گەراخستنی کولتووری داپلۆسێنەرانەی ئەم سێ ئیمپراتۆرییەش بووە. ئەوان لەپاڵ وێرانکردن و تالانکردنی کوردستاندا دژە کولتووری خۆیشیان سەپاندووە.

پێکەوە ژیانی ژێردەستانەی سەدان ساڵی ئێمە و ئەو ئەتەوە داگیرکەرانە بۆتە هۆی ئەوەی ئێمە لە زۆر رووەوە رەنگی ئەوان

بگرین، داب و نەریت و کولتووری نێگەتیڤانەی ئەوانمان بەسەردا بسەپێنن. ئاخۆ کاتێ لەشکری عەرەبی ئیسلامی کوردستانی داگیرکرد، گەلی کورد کام لایەن و ناوەرۆکی ئینسانی ئیسلامی لەنێودا بلاّوکرابەوە؟ تا چ ئەندازەیەک گیانی ئیسلام گەیشتە کوردستان و لەنێو کە سایەتی و سایکۆلۆژیای مرۆڤی کورددا رەنگی دابەوە؟ هەروا تا چ رادەیەک داب و ترادیسیۆن و کولتووری نێگەتیڤانەی عەرەب و نەتەوە داگیرکەرەکانی ترمان وەرگرت؟!

گومانم نییە کە ئەم نەتەوە سەردەستانە بۆ کۆیلەکردنی گەلی کورد پێویستیان بە دڕندانە ترین میتۆد و چەواشەترین کولتوور بووە. چونکە بە درێژایی سەدان ساڵ گەلی کورد بەرەنگاری سەختی داگیرکەرە فرەجنسیەکانی کردووە. مێژوونووس مەحمەد ئەمین زەکی لە کتێبە مێژووییە بەناوبانگەکەیدا و، بە پشتبەستن بە خودی سەرچاوە عەرەبییە ئیسلامییەکانی ئەو سەردەمانە، دەیان راپەڕین و بەرەنگاربوونەوەی خەڵکی ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستان لە دژی دەسەلاّتی عەرەبی ئیسلامی باس دەکات. هەروا راپەرین و شۆرشەکانی کورد دژی ئیمپراتۆری تورکی عوسمانی و ئیمپراتۆری فارسی ئێرانی بەشێکی گەورەی مێژووی ئێمە و ئەوانیان گرتووە. ئاشکرایشە وەک چۆن هەڵگیرساتی ئەم شۆرش و راپەڕینانە نیشانەی رەتکردنەوەی ژیانی کۆیلایەتی و دەسەلاّتی بەربەریستی داگیرکەر بوون، ئەوا دامرکاندنەوەیان پێویستی بە دڕندانەترین شێوەی داپلۆسین بووە، کە لە جەرگەی کولتووری داپلۆسینەرانەی خۆیانەوە هەڵقولاّوە. ئەوان بۆ درێژەدان بە داگیرکردنی کوردستان و ولاّتانی تر، بەردەوام پێویستیان بە بەرهەمهێنانەوەی کولتووری نێگەتیڤانە بووە.

ئەوان لە کوردستاندا هەر ناوێکیان لە خۆیان نابێ، جگە لە داگیرکەر شتێکی تر نەبوون. پرۆسەی داگیرکردنیش، لەهەر سەردەم و شوێنێکدابێ، نائینسانی ترین دیاردەیە چونکە جگە لە کۆیلایەتی و چەساندنەوە شتێکی تر لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ. دیارە هەروەڵێن (شارستانییەکیش) کە داگیرکەران بۆ داگیرکراوانی دێنن کولتووری داپلۆسێنەرانە و داب و مۆراڵ و نەریتی بەربەریستانەیە.

ئەگەر پرۆسەی کۆلۆنیالکردن و داگیرکردنی سەدان ساڵەی کوردستان دزێوترین کولتووری عەرەب وفارس و تورکی لە کوردستاندا رواندبێت ئەوا پرۆسەی سەدان ساڵەی خەبات و راپەرینی گەلی کورد کولتووری بەرەنگاری و ئازادیخوازانەی خۆی هێناوەتە بەرهەم. ئەم کولتوورە لە پرۆسەی پەرەگرتنی خەباتی رزگاریخوازیدا گەشەی کردووە و بە ناوەرۆکی شۆڕشگێرانە و دیموکراتیخوازانە دەوڵەمەندتر بووە.

پێم وایە ئەم کولتوورە گەورەترین سامانێکی فیکری و رۆحیی نەتەوەکەمان و بزوتنەوە رزگاریخوازییەکەمانە. هەروا گەورەترین چەپەرە لەبەردەم ئەو کولتوورە نیگەتیڤ و بەربەرستییەی کە ئیمرۆ وەچەرەسەنەکانی ئەو ئیمپراتۆرییە ملهوڕانە لە کوردستاندا بلاوی دەکەنەوە، دەیانەوێ بە هۆیەوە سەرجەمی ژیانی فیکری و کولتووری و کۆمەلایەتیمان بشێوێنن و کەسایەتی مرۆڤی کورد بتەپێنن.

جەنگی کولتووری نێوان ئێمە و داگیرکەران و کۆلۆنیالیستانی تورک و عەرەب و فارس تەواوکەری جەنگی رزگاریخوازیمانە. خۆ دەربازکردنیش لە رەگەز و لایەنی کولتووری نیگەتیڤی داگیرکەران بەشێکی سەرەکی خەباتی کولتوورییمانە، کە تەناتەت دوایی

ڕزگاربوونی سیاسیی و ئابووری هەر درێژەی دەبێ.
ئێمە وەک چۆن بە درێژایی سەدان ساڵ گەورەترین تاوانی مێژوویمان بەرانبەر کراوە، گەورەترین ئەرکیشمان خراوەتە ئەستۆ. ئێمە چۆن بکارین و لە ئاستی ئەو ئەرکە مێژووییە دابین؟ چۆن بتوانین لەنێو تاریکستانی ئەم جەنگەڵەدا وەک نەتەوەیەکی سەربەخۆ پەیامی ئینسانیی و نیشتمانیی خۆمان بە ئەنجام بگەیەنین؟.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان

١- عەلی میر فیترووس، ئیسلام ناسی، سەرچاوەی پێشوو. لاپەرە ٧٥.
٢- العقید الركن احمد الزیدي، البناء المعنوي للقوات المسلحة العراقیه، بیروت، الطبعه الاولی ١٩٩٠ ل٢٥.
٣- بروکلمان، تاریخ الشعوب الاسلامیه- لیلیب حتی تاریخ الاعراب، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٢٥.

بەشی چوارەم:

# سەروەری مێژوویی، یان ملهوڕی مێژوویی؟

دوای داتەپینی هەرسێ ئیمپراتورییەکەی رۆژهەلات (ئیمپراتۆری عەرەبی ئیسلامی، تورکی عوسمانی، فارسی ئێرانی)، دوو جۆرە میراتیان بۆ ئێمە و بۆ وەچە ( شەرعییەکانی) خۆیان لێکەوتەوە:

بۆ ئێمە کۆیلایەتییەکی لە جاران سەختتر و چەوساندنەوەیەکی دڕندانەتر...

بۆ وەچەکانیشیان کولتوورێکی داپڵۆسێنەرانە و سەروەرییەکی درێژنانەی داگیرکردنی ولاَتانیتر و کۆیلەکردنی نەتەوەکانیتر.

ئەم دوو میراتە پێک ناکۆکە ـ تێک ئالاَوە بوونە دوو جەمسەری مێژووی ئەم حەفتا ـ هەشتا ساڵەی ئێمە و ئەوان:

جەمسەرێکیان: کۆشش و خەباتە بۆ رزگار بوون لەم میراتە لەعنەتییە دزێوە و لە پێناوی رزگار بوون و ئازادیدا...

جەمسەرەکەی دیکەیان: کۆشش و خەباتە بۆ پارێزگاری ئەم میراتە (پڕ لە سەروەرییە) و درێژەدان بە کوشتن و کۆیلەکردنی خەڵکیتر، کە

کوردستان کێڵگەی ئەم کوشتارە بووە، بەو پێیەی دوا میراتی هەرسێ ئیمپراتۆریەکەیە (دیارە جگەلە ئێران کە نەتەوە و وڵاتی تری ژێر دەستەی تێدایە)

بۆیە دەتوانم بڵێم ئەگەر لایەنێکی کارەساتی نەتەوەی کورد لەوەدا بێ کە بە درێژایی سەدان ساڵ خۆی و خاکەکەی و هەموو شتێکی گیاندار و بێ گیانی نێو نیشتمانەکەی لە لایەن دەسەڵاتدارانی سێ نەتەوەی زاڵەوە داگیرکرابێ، ئەوا لایەنەکەی دیکەی کارەساتەکە ئەوەیە هەر کام لەم سێ نەتەوە زاڵانەی کوردستان بە وڵاتەکەیانەوە گرێدراوە سەردەمێکی دوورو درێژ خاوەنی ئیمپراتۆریەکی ملهوڕی چنگ بە خوێن بوون. هەریەک لەم ئیمپراتۆریانە خودانی مێژوویەکی سەدان ساڵەی پەلاماردان و داگیرکردنی وڵاتانی تر و کۆیلەکردنی گەلانی تر بوون. هەریەکەیان بە ئەندازەی دەقاتی ڕووبەری خاک و نیشتمانی خۆیان خاک و وڵاتی نەتەوەکانی تریان داگیر کردبوو... هەریەکەیان دە ئەوەندەی ژمارەی کەسانی نەتەوەکەی خۆیان خەڵکی نەتەوەکانی تریان کۆیلە کردبوو.

ئەگەر دوێنێ کوردستان کاروانسەرا و هەوەڵین ئامانجی پەلاماری زۆربەی ئەم ئیمپراتۆریانە بووبێ، ئەوا ئیمڕۆ دوا پاشماوەی ئەم ئیمپراتۆریانە و دوا وڵاتی ژێردەستەی وەچە میراتگرەکانیانە... ئەگەر دوێنێ نەتەوەی کورد هەوەڵین کێڵگەی تاقیکردنەوەی کوشتن و سەربڕاندن بوو بێ بۆ ئەم ئیمپراتۆریانە، ئەوا ئەمڕۆ دوا کێڵگەی کوشتن و لەناوبردنی بە کۆمەڵە وەچەکانیان.

لام وایە ڕیشەی کۆنە پەرستی و گیانی شۆڤێنیزم لە نێو ئەو وڵاتانەی کوردستانیان پێوە گرێدراوە لە داگیرکردنی سەدان ساڵەی

وڵاتانی تر و لە داگیرکردنی تا ئیمڕۆی کوردستانەوە سەرچاوە دەگرن. چونکە ناسیۆنالیستان و شۆڤینیستانی ئەم نەتەوانە، لە پرۆسەی داپلۆسینی خەڵکی دیموکراتیخوازی نەتەوەکەیان و ، لە پرۆسەی کۆیلەکردن و لەناوبردنی نەتەوەی کورد دا، هێزو ڕزەی ڕۆحی و ئەخلاقی خۆیان لە مێژووی خوێنڕێژانەی ئیمپراتۆریەکانیان و لە کولتووری نێگەتیڤیانە و داپلۆسینەرانەی نەتەوەکانیانەوە هەڵدێنجن. ئەم مێژوو کولتوورە گەورەترین ساماتێکە کە ناسیۆنالیستانی تورک و عەرەب و فارس پشتی پێدەبەستن و بە بەشێکی مەزنی سەروەری قەومی خۆیانی دەزانن و دەیانەوێ لە بیر و ئاگایی ( هۆشیاری ) و سایکۆلۆژیای قەومی و کۆمەڵایەتی خەڵکی نەتەوەکانیاندا بیانهێڵنەوە. ئەوان لە کاتێکدا کوردستان بە میراتێکی (شەرعی) ئیمپراتۆریەکانیان دادەنێن، ئەوا لە درێژە پێدانی داگیرکردنیدا شانازی و بیرەوەری قەومی خۆیان و (سەروەری!) باپیرانیان دەدۆزنەوە!!

مرۆڤ تەنیا گیانلەبەرێکی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو گیانلەبەرێکی نەتەوەییشە. واتا مرۆڤ تەنیا بەرهەمی واقیع و دەوروبەرە کۆمەڵایەتییەکەی نییە، بەڵکو بەرهەمی دەوروبەرو واقیعە نەتەوەییەکەیشیەتی. چونکە هەر دەوروبەرێکی کۆمەڵایەتی سروشت و بوونێکی نەتەوەیی هەیە، کە لە ئەنجامی پرۆسەیەکی هاوبەشی مێژوویی سەدان ساڵەی ئەو کۆمەڵە خەڵکانەدا دروست بووە کە لەسەر یەک خاک دەژین و بەیەک زمان دەپەیڤن و ڕووبەڕووی چارەنووسێکی هاوبەش بوونەتەوە. بۆیە مرۆڤ وەک ئەندامێکی نەتەوە، بەر لە هەموو شتێک بەرهەمی ئەو مێژوو و کولتوورەیە کە نەتەوەکەی لە پرۆسەی بوونی

بابەتیانە و مێژووییانەی خۆیدا هێناویەتە بەرهەم، ئەم کولتوور و مێژووە بەردی بناغەی کەسایەتی و خاسیەتی ڕێکچووی گشتی نەتەوەکە دیاری دەکەن.

بەڵام بەو پێیەی جیاوازییەکی تایبەتی لە نێوان ئاستی هۆشیاری و کولتوور و دەرککردن بە بەرژەوەندی نەتەوەیی و چینایەتی ئەندامانی نەتەوەدا هەیە، ئەوا پرۆسەی کارتێکردنی لایەنە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانی ئەم کولتوور و مێژووە سروشتێکی نیسبییانە بە خۆی دەگرێ و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕدرێ، بێ ئەوەی ئەم جیاوازییە تاکە کەسییانە خاسیەتی گشتی سایکۆلۆژیا و داب و نەریت و ترادسیۆنی نەتەوەکە بسڕنەوە.

لێرەوە شتێکی سروشتییە و بگرە مێژوو کردە کە جیاوازییەکی چۆنایەتی قووڵ، لە ڕووی هۆشیاری نەتەوەیی و داب و نەریت و کەسایەتی و سایکۆلۆژییەوە، لە نێوان کەسانی نەتەوەیەکی چەوسێنەر و سەردەست و لە نێوان کەسانی نەتەوەیەکی چەوساوە و ژێر دەستدا هەبێ، چونکە ئەم دوو نەتەوانە لە پرۆسەی مێژوویی خۆیاندا دوو جۆرە کولتوور و بەسەرهاتی مێژوویی تەواو لێک جیاوازیان هێناوەتە بەرهەم (دیارە وەک کولتووری زاڵ) یەکەمیان، مێژوو و کولتووری کۆیلەکردنی نەتەوەی‌ترو داگیرکردنی خاکی خەڵکی‌تر، دووەمیان مێژوو کولتووری ژێر دەستی و خەبات بۆ سەربەخۆیی و ئازادی. دیارە ئەم دوو دیاردە باوەی مێژوو و کولتووری هەردو لا بەو مانایە نییە کە لە یەکەمیاندا گیانی دیموکراتی و بەرەنگار بوونەوە نییە و لە دووەمیشیان گیانی زۆرداری و داپلۆسین نییە. بەڵام بە ڕای من توخمەکانی ئەم جۆرە گیانە پۆزەتیڤە لای یەکەمیان نێگەتیڤە، لای

دوومیان ناتوانن بە ئاسانی بینە دیاردەی پاوو سەرەکی.

ئایا میژووی خوێنڕێژانەی سەدان ساڵەی نەتەوەکانی وەک ئینگلیز، فەرەنسایی، تورک، عەرەب، فارس،... کە ناسیۆنالیستانی ئەم نەتەوانە شانازی پێوە دەکەن، لە سایکۆلۆژیاو بیری زۆربەی خەڵکی ئەم نەتەوانەدا سڕاونەتەوە؟! ( میلان کۆندرا ) جوانی بۆچووە کە دەڵێ:

نەتەوە گەورەکان خۆیان پێ ئەمرە... چونکە خۆیان بە دروستکەری میژوو دادەنێن[1] بەڵێ... ناسیۆنالیستە شۆڤێنییەکانی تورک و عەرەب و فارس سەروەری قەومی خۆیان لەو میژوودا دەبینن کە ئیمپراتۆریەکانیان بە وێرانکردن و تالانکردنی ولاتانی ترو کۆیلەکردنی نەتەوەکانی‌تر دروستیان کردووە. ئەوان هێشتا بە بیرەوەری و خەیاڵ و (سەروەری) ئەو رۆژگارانەوە دەژین کاتێ شمشیری باپیرانیان هێندە بە زەبر بوو کە دەیتوانی لە چەند ولات و کیشوەرێکدا سەر بپەڕێنێ... کاتێ لە ولاتانی ژێر دەستیاندا بە ترخترین شتومەکیان تالان دەکرد و جوانترین کیژ و ئافرەتیان هەڵدەبژارد و دەیانکردنە ( جەواری ) شەوە سوورەکانیان و کەنیزە و خزمەتکاری ماڵەکانیان... بۆیە ئەوان، تا کۆیلەی کولتووری نیگەتیڤانە و میژووی داپلۆسینەرانەی نەتەوەکەیان بن، ناتوانن لە ڕوانگەی شارستانی و دادپەروەری و مرۆڤ دۆستیەوە دان بە مافی دیموکراتی خەڵکی ولاتەکەیان و دان بە مافی بڕیاردانی چارەنووسی نەتەوەی کورد دا بنێن. ئەوان کە، لە پیشەی کوشتن و داگیر کردن بەولاوە کارێکی تر نازانن، ئازادی و سەروەری خۆیان لە کۆیلەکردن و لەناوبردنی خەڵکی‌تردا دەبینن.

با لە نێوان دەیان و سەدان کارەساتی خوێناوی کەم وێنەدا، وەک نموونەی ئەم ( ڕەسەنایەتییە ) میژوویەی داگیرکەرانی کوردستان

بەراوردی نێوان ڕووداوێکی دێرین و ڕووداوێکی هاوچەرخ بکەین.

مێژوو نووسی کورد عەبدولقادری ڕۆستەمی بابان لە کتێبە مێژووییە بە نرخەکەیدا ( سیر الاکراد ـ ڕەوشی کوردان ) باس دەکات، کاتێ لەشکری ئیسلام بۆ کۆیلەکردنی نەتەوەی کورد درێژە بە داگیرکردنی کوردستان دەدات، لە ناوچەی شارەزوور و پاوە تووشی بەرەنگار بوونەوەی سەختی کوردەکان دێ کە داکۆکی لە خاک و ماڵ و ئایدیالی ڕۆحی خۆیان دەکەن. دوای شەڕێکی گەرم کوردەکان دەشکێن، ئیتر وەک نووسەر باس دەکات:

( لەشکری ئیسلام سێ شەو سێ ڕۆژ خەڵکیان کوشت! لە ئەنجامدا لافاوی خوێن لە قەد پاڵی کێو وەک چەم هەستا... هەموو کوردەکان کوژران... ژن و منداڵیان بە نسیب لەشکری عەرەب بوو... ژنەکانیان داگیر کران.)(٢)

ئایا چ جیاوازییەکی چۆنایەتی لە نێوان ئەم جۆرە پەلاماردانە و هێرشەکەی ١٩٨٨ی ئەنفالەکانی سوپای داگیرکەری عێراق بۆ سەر ناوچەکانی گەرمیان و قەرەداغ و دۆڵی جافایەتی و دەشتی هەولێر و بادینان و... هتد هەیە؟ کاتێ بە هەزارانیان لەناو برد، بە هەزاران کیژ و ئافرەتی کوردیان بە پێی (شەهامەت) و (کەرامەت)ی قەومی زەوت کردن و بەشێکیان لە پاداشتی کۆمەکی (قەومی) قادسیەدا ڕەوانەی عەممان و هەندێ لە پایتەختەکانی وڵاتانی کەنداو کردن، تا لەوێ وەک کاڵایەکی هەرزان هەراج بکرێن!! ئایا ناونانی ئەم هێرشە فراوانە بە (ئەنفال) کارێکی ڕێکەوتە، یان هەوڵدانێکە بۆ تیژکردنی بیری (قەومی) عەرەب تا بێتەوە بیریان کە ئەوان هەمان مێژووی باپیرانیان دووبارە دەکەنەوە کە لە ئایەی (ئەنفال )دا باسی لێوە

کراوە!!

ئایا ئەو هەموو دڕندایەتییە کەم وێنەیەی سوپای دڕندەی عێراق، یان لەشکری سەربەهێنی ئێران، یان جەندرمەکانی تورک لە کوردستاندا دەیهێنن هێستیریایەکی کاتییە، یان دڕندایەتییەکی ڕەسەنە و پشت بە مێژوویەکی دوورودرێژ و کولتوورێکی داپڵۆسێنەرانە دەبەستێ؟!

ئەگەر دوێنێ هەرسێ ئیمپراتۆرییە داتەپیوەکەی ڕۆژهەڵات بە تیۆری تایبەتی ئیسلامەوە هەزاران تاوانیان بەرامبەر بە خەڵکی خۆیان و نەتەوەکانی‌تر کردبێ، ئەوا ئەمڕۆ وەچە میراتگرەکانیان هەمان تاوان، بەڵام بەجۆرێکی دڕندانەتر و بە ڕێ و شوێنی مۆدێرنانە دەرهەق بە نەتەوەی کورد دەکەن، هێزی ڕۆحی و ئەخلاقی خۆشیان، پێش هەموو شتێک لە مێژووی خوێنڕێژانەی ئیمپراتۆرییەکانیان و لە درێژە پێدانی داگیرکردنی کوردستان وەردەگرن!

ئاخۆ ئەمە کارێکی ڕێکەوتە، یان ئەنجامێکی حەقی ئەم کولتوور و مێژووە و ئەنجامێکی لۆژیکی داگیرکردنی تا ئێستای کوردستانە، کە تورکیا، عێراق و ئێران، لە هەموو وڵاتانی تری ناوچەکە زیاتر ڕژێمی دیکتاتۆری فاشی، کۆنەپەرست، ڕەگەزپەرست تیرۆریستیان بە خۆیانەوە دیوە؟!

ئایا تەنیا ڕێکەوتە یان ئەنجامێکی لۆژیکی داگیرکردنی کوردستان و کۆیلە کردنی نەتەوەی کوردە، کە لە نێو زیاتر لە بیست دەوڵەتی عەرەبیدا گیانی شۆڤێنیزمی عەرەبی و ڕەگەزپەرستی لە عێراق و سووریادا لە هەموو وڵاتانی تری عەرەب بەهێزتر و بەربڵاوترە؟!

ئەگەرچی مانەوەی کوردستان بە ژێر دەستەی ئەم دەوڵەتانە، پێش هەموو کەسێک کارەساتێکی مادی و ڕۆحییە بۆ نەتەوەی کورد، بەڵام

وا دەزانم نەتەوە سەردەستەکانی ئەم وڵاتانەش لە ژێر دەستگرتنی نەتەوەی کورد دا، تووشی بەڵاو کۆیلەیی دەبن. کاتێ خۆی کە مارکس دەیگوت نەتەوەیەک ناتوانێ ئازاد بێ ئەگەر نەتەوەیەکی دیکە بچەوسێنێتەوە، ئەم قسەیەی هەر مەبەستێکی ئەخلاقی نەبوو، بەڵکو لام وایە لە ئاوەڕۆکدا مەبەستی ئەوەبوو کە چەوساندنەوەی نەتەوەیەک لە لایەن نەتەوەیەکی ترەوە زەمینەی بە پیت بۆ سەرهەڵدانی تیرۆر و داپڵۆسین و کۆنەپەرستی و شۆڤینیزم لای نەتەوەی سەردەست دروست دەکات و رەوشت و داب و نەریت و سەرجەمی ژیانە رۆحییەکەی دەشێوێنێ. بۆیە لای وابوو چارەکەی خەسیسی ئینگلیز داگیرکردنی ئیرلەندایە. هەروا لینین لای وا بوو کە ریشەی کۆنەپەرستی لە رووسیادا، لە کۆیلەکردنی نەتەوە غەیرە رووسەکانەوە، سەرچاوەی گرتووە.

داگیرکردنی کوردستان و چەوساندنەوەی نەتەوەی کورد، بە درێژایی دەیان و سەدان ساڵ شێوەی داپڵۆسین و تیرۆر و کولتووری تایبەتی خۆی هێناوەتە بەرهەم و کردوونی بە بەشێکی ئۆرگانیکی لە داب و نەریت و ترادیسیۆن و کولتوور و ژیانی سیاسی و فیکریی ئەم کۆمەڵگایانە. چونکە لە بنەڕەتدا بە زەبری ئەم تیرۆر و داپڵۆسینە خوێناوییە، نەتەوەی کورد لە نێو سنووری ئەم دەوڵەتانەدا راگیراوە. لام وایە تا ئەو رۆژەی نەتەوەی کورد ژێر دەستەی ئەم وڵاتانە بێ، ئەوا ئەم تیرۆر و زەبر و زەنگە وەک پێداویستییەکی حەیاتی ئەم کۆمەڵگایانە دەبێ. بە واتایەکی‌تر تا کوردستان ژێر دەستەی ئەم وڵاتانە بێ، ئاسان نییە و رەنگە مەحاڵ بێ، دیموکراسی راستەقینە لە هیچ کام لە وڵاتانی تورکیا، ئێران، عێراق و سووریادا بچەسپێ(٤)

دەشێ ئەمە ئەوەیاجە سەختە بێ کە نەتەوەی زاڵ و چەوسێنەر دەبێ بیدات. چونکە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەگەر دیموکراسی ڕاستەقینە لەم وڵاتانەدا پیادە بکرێ ئەوا مانای وایە ئەو ئازادییەش بە نەتەوەی کورد دەدرێ کە بەدەستی خۆی چارەنووسی خۆی بە مانەوە لەگەڵ ئەم نەتەوانە، یان جیابوونەوەو سەربەخۆ بوون، دیاری بکات.

هێشتنەوەی کوردستان، بە دوور لە ویست و ئیرادەی نەتەوەکەی، لە نێو قەوارەی ئەم وڵاتانەدا پێویستی بە بەرهەمهێنان و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی تیرۆر و زەبر و زەنگ و داپڵۆسین هەیە. ئەمە ڕاستییەکە کە داخەکەم تا ئێستا هێزە دیموکراتیخواز و چەپ و مارکسییەکانی تورک و فارس و عەرەبی عێراق و سووریا دەرکیان پێ نەکردووە، بۆیە نەک هەر داکۆکی لە مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەلی کوردستان ناکەن بەڵکو بێ باکانە ( لا أبالي ) سەرلەجێی داگیرکردن و الحاق کردنی کوردستان و ئەنجامەکانی دەدەن بگرە زۆربەیان کوردستان بە بەشێکی تەبعەی نیشتمانەکەی خۆیان دەزانن و وەک هەر شۆڤێنیست و کۆلۆنیالیستێک، سەربەخۆیی کوردستان بە لەتکردنی خاکی (پیرۆز )ی خۆیان دادەنێن.

بەرای من بۆ ئەوەی ئەم هێزانە و نەتەوەکانیان، زووتر لە تیرۆر و داپڵۆسین دەربازبن و، بۆ ئەوەی دیموکراسی ڕاستەقینە لە وڵاتەکانیاندا بچەسپێ دەبێ یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی دیاردەی داپڵۆسین و نەبوونی دیموکراسی ، کە داگیرکردنی کوردستانە، بنەبڕبکرێ. بۆیە دەبێ ئەوان نەک هەر دژی مافی بڕیاردانی چارەنووسی نەتەوەی و نیشتمانی کورد نەبن و، بە دروشمی سەراپیانەی ئۆتۆنۆمی خۆیشیان و خەڵکی تریش هەڵنەخەڵەتێنن، بەڵکو دەبێ لە ڕیزی پێشەوەی

داخوازیکارانی ئەم مافەوە بن. چونکە گەیشتنی نەتەوەی کورد بە مافی بڕیاردانی چارەنووس و سەربەخۆیی ئیشتمانی، بۆرژوازی دەسەڵاتدار و هێزە کۆنەپەرستەکانی ئەم وڵاتانە لە زەقترین بەهانەی ئیستیبداد و ملهوڕی و زەوتکردنی دیموکراسی پێبەش دەکات.

## سەرچاوەو پەراوێزەکان

١- بڕوانە: ڕۆژنامەی ( کۆمار ) ژمارە/١ سەرۆک خەزنەداری .١٩٩ ل١٢ .
٢- بڕوانە: عبدالقادر إبن رستم باباني، سير الاكراد، سەرچاوەی پێشوو.
* بە پشت بەستن بەم بۆچوونە بە گومانەوە بۆ ئەو پڕۆسە دیموکراتییە دەڕوانم کە لە یەکێتی سۆڤیەتدا سەری هەڵداوە. چونکە ڕەنگە دوو ڕێگا هەبێ: یان سەرگرتنی دیموکراسی ڕاستەقینە کە مانای هەڵوەشاندنەوەی ئەم یەکێتییە ناداوەپەروەرییەی بەسەر نەتەوەی کۆمارەکاندا سەپێندراوە و بە زەبری کوشتن و بڕین ڕاگیراوە، یان پاراستنی ئەم ئەوارە لیبراڵییە، کە ئەمەیش بەرهەمهێنانەوەی دیکتاتۆری و زەبروزەنگی گەورەکە، واتا تێکشکانی پڕۆسە ساوایەکەی دیموکراسی.

بەشی یەکەم

# دەربارەی ناوەرۆک و ئامانجەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان

## وتەیەک

نەتەوەی کورد بە گشتی و بزوتنەوە رزگاریخوازە نیشتمانییەکەی بە تایبەتی رووبەرووی مەترسیێکی ئەوتۆ بوونەتەوە کە هەڕەشە لە سەرجەمی بوونی نەتەوەییمان دەکات. ئەم مەترسییەش لە سەرێکەوە لەوە دایە کە رژێمە شۆڤێنیستە داگیرکەرەکانی کوردستان، بەپێی پیلانێکی فراوان، هەوڵی تواندنەوە و لەناوبردنی فیزیکی و روحی گەلی کورد دەدەن و، بە هۆی نەبوونی دیموکراسی و نزمی ئاستی سیاسی و رادەی شارستانی کۆمەڵگاکانیانەوە، لەوە دەچی توانیبیان هۆشیاری کۆمەلایەتی زۆربەی خەڵکی تێک بدەن تا ئەورادەیە بە نەفیوتی ئایدیولۆژیای بورجوازی گێژیان بکەن، کە نەک هەر لە رووی سیاسەتی چەوساندنەوە و لەناوبردنی گەلی کورد بە دەنگ نەیەن و لایان ببێتە شتێکی ئاسایی و سروشتی، یان مافی بڕیاردانی چارەنووسی پێرەوانەبینن، بەڵکو خاکی کوردستانیش بە موڵکی نەتەوەی خۆیان بە بەشێکی دانەبڕاو و(پیرۆز)ی نیشتمانەکەی خۆیان

دابنێن. بە واتایەکی دی نزمی هۆشیاری سیاسی و ڕادەی شارستانیی و کولتووری ئەم کۆمەڵگایانە و گێژبوونیان بە تەفیوتی ئایدیۆلۆژیای بورجوازی شۆڤێنی بوونەتە هۆی ئەوەی بەشی زۆری خەڵکی ئەم نەتەوانە دەرک بە مانا و جەوهەری ئازادی خۆیان نەکەن بەو پێیەی نەتەوەیەک، مارکس گوتەنی، ناتوانێ ئازادبێ کاتێ نەتەوەیەکی تر دەچەوسێنێتەوە.

لایەنەکەی تری ئەو مەترسییە بەرای من، لەوەدایە کە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی کورد لەگێژاو و تەنگوچەڵەمەیەکی فیکری، سیاسی و کۆمەڵایەتیدا دەژی و، سەرەڕای ئەو هەموو قوربانییە مەزنە جۆربەجۆرانەی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان داویانە، کەچی هێشتا بزووتنەوەکەیان یەکگشتی، یان لەهەر بەشێکی کوردستاندا نەبۆتە ئەو چۆنایەتییە یەکگرتووە نوێیەی کە بەپێی پڕۆگرامێکی زانستی ئامانج و ستراتیژی خۆی دابڕێژێ و بتوانێ کۆمەڵانی خەڵک لە دەوروەی خۆی کۆبکاتەوە و بەرەو سەرکەوتن ڕێبەرایەتییان بکات.

لەم باسانەدا هەوڵ دەدەم هەندێ پرسیار و بیروڕای خۆم، وەک نووسەرێک، سەبارەت بە سروشت و ناوەڕۆک و هەندێ لایەنی فیکری- ئایدیۆلۆژی بزووتنەوەکە بخەمەروو، کە زیاتر بە مەبەستی بیرکردنەوە و پرسیارکردنن نەک دەستنیشان کردنی چارەسەر بۆ گیروگرفتەکان، چونکە ئەمەیان کارێکە دەبێ بە کۆمەڵ ئەنجام بدرێ.

لە کاتێکدا بزووتنەوەی گەلی کورد بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی نیشتمانییە بۆچی لە سنووری بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی خاوەن ئامانجی دیموکراسی تەسکدا تەنگەبەر کراوە؟ ئایا ئەم دیاردەیە باروودۆخێکی بابەتی مێژوویی سەپاندوویەتی یان بە هۆی لاوازی بزووتنەوەکەیە،

یاخود ئەنجامی سروشتی سەرکردایەتیەکەیەتی؟ ئایا تەنگوچەڵەمەی بزوتنەوەکە تەنگوچەڵەمەی فیکر و ئایدیولۆژیای سیاسی سەرکردایەتیەکەیەتی یان شتێکی ترە؟ ئایا سروشتی خۆهەڵپەسێرانە و پەیرەوکاراتەی هێزە سەرەکییەکانی نێو بزوتنەوەکە دیاردەیەکی رێکەوتە یان پێداویستییەکی حەقیییە؟ ئایا بزوتنەوەی کورد بەشێکە لە بزوتنەوەی دیموکراسی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەردابەش کراوە و، بوونی دیموکراسی لەو وڵاتانەدا چارەسەری مەسەلەی کورد دەکات یان ئاڵۆز تری دەکات؟ ئایا جیاوازی لە تێران قۆناخی ئەمرۆی کۆمەڵگای کوردستان و کۆمەڵگای ئەو وڵاتانەدا نییە؟ ئاخۆ پەیوەندی نێوان بزوتنەوەی کورد و بزوتنەوەی دیموکراسی لەهەر یەکێک لەو وڵاتانەدا لەسەر بنچینەی و دانان بە تەواوی مافەکانی یەکتری دامەزراوە یان پێوەندییەکی لاسەنگە و رەنگدانەوەی لاسەنگییە بابەتییەکەی پەیوەندی نێوان هەردوو نەتەوەیە؟.

ئەوا سەدەیەک، یان هەندێک لایان وایە زیاترە، بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد وەک دیاردەیەکی بابەتی و مێژوویی سەری هەڵداوە. کەچی تائێستا لە هیچ بەشێکی کوردستاندا، لەبەر کۆمەڵێک هۆکاری بابەتی و خۆیی، ئابووری و سیاسی، ناوخۆیی و دەرەکی، نەیتوانیوە بە ئامانج و ئاواتە سەرەکییەکەی خۆی بگات کە دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەییە. بەو پێیەی دەڵێ: (پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیی رێباز و-ئاواتی- هەموو بزوتنەوەیەکی نەتەوەییە)[1] بەڵام ئەم بزوتنەوەیە، لە پرۆسەی گەشەکردن و خەباتیدا کۆمەڵێک گۆڕانکاری چۆنایەتی بەسەر فیکر و سروشت و هێزە کۆمەلایەتییەکانیدا هاتوون و پراوپڕ ناوەڕۆک و خاسیەتەکانی

بزووتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی وەرگرتووە کە سەرباری ئامانجە نەتەوەییەکانی ئامانجی کۆمەلایەتیشی گرتۆتە ئەستۆ.

ناکۆکییەکانی نێو بزووتنەوەکە و تەنگوچەڵەمەی فیکری و سیاسی ئەو هێزانەی سەرکردایەتی دەکەن لەو راستییە ناگۆڕن کە ئەم بزووتنەوەیە بەرهەمێکی سروشتی پێداویستییە بابەتییەکانی ژیانی ئابووری و نەتەوەیی و سیاسیی کۆمەڵگای کوردستانە، وەک هەر بزووتنەوەیەکی رزگاریخوازی، لە بنچینەدا بە هۆی ناکۆکی توندی نێوان کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان و نێوان دەسەڵاتی کۆلۆنیالی و نیمچە کۆلۆنیالی بێگانەوە سەری هەڵداوە، بەو ئامانجەی ئەو ناکۆکییە چارەسەر بکات کە هەموو رێگایەکی لە رووی گەشەکردنی ئابووریی، کۆمەلایەتیی، سیاسیی و کولتووری گەلی کورد بڕیوە.

ئەگەر بزووتنەوەی نەتەوەیی لە ولاتانی ئەورووپادا سروشتی شۆرشی بورجوازی دژ بە فیودالیزمی بووبێ و، لە بنچینەدا بە هۆی گەشەکردنی بابەتییانەی پەیوەندییەکانی ئابووریی سەرمایەداری و پێداویستی دروست بوونی بازاری ناوەندی و یەکخستنی هەرێمە فیودالییە لێکدابڕاوەکانەوە سەریان هەڵدابێ، ئەوا ئەم بزووتنەوانە لای نەتەوە ژێر دەستەکان بەو ئامانجە بووە ئەو کێشە دەرەکییە چارەسەر بکرێ کە بۆتە هۆی ئەوەی نەتەوەی ژێردەست لەلایەن نەتەوەی بەهێز و دەسەڵاتداری بێگانەوە بچەوسێندرێتەوە- بە واتایەکی دی ناکۆکی بابەتی ئابووری لە نێوان پەیوەندییەکانی ئابووریی فیودالی و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا شێوەی کێشەی نەتەوەیی بەخۆ گرتووە- بۆیە خەبات لە پێناوی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ وەک پێداویستییەکی ئابووری، بە قۆناغێکی

گرنگ و پێویستی گەشەکردنی سەرمایەداری دادەندرێ- پێم وایە لەم روانگەیەوە بوو لینین ئەو بایەخەی بە مەسەلەی مافی چارەنووسی نەتەوەکان دەدا و بە گەرمی داکۆکی لێدەکرد، چونکە سەرباری ناوەرۆکی ئینسانی و رەوای ئەم مافە، بە رێگەی سەرەکی گەشەکردنی ئەم نەتەوانەی دەزانی.

لەم بۆچوونەوە بەرای من بەبێ چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکییە دەرەکییەی بزوتنەوەکەی خولقاندووە، واتا بەبێ گەیشتنی نەتەوەی کورد بە مافی بڕیاردانی چارەنووس، رێگای سروشتی لەبەردەم گەشەکردنی سەرجەمی ژیانی مادی و رۆحیی کۆمەڵگای کوردستاندا بە بەستراوی و نیمچە بەستراوی دەمێنێتەوە و، نەتەوەی کورد نەک تەنیا هەر دیل و بێماف دەبێ بەڵکو لە بەرامبەر پاراستنی ئاشتی جیهان و گەشەپێدانی شارستانی سەردەمدا بێ ئەرکیش دەبێ. چونکە زەفتکردنی مافەکانی نەتەوەی کورد، لە بنچینەدا، زەفتکردنی ئەرکەکانیشیەتی.

بەڵام بۆ ئەوەی بزوتنەوەی کورد بتوانێ ئەم ناکۆکییە دەرەکییە چارەسەر بکات و ئەرکی مێژوویی خۆی بە ئەنجام بگەیەنێ، ئەوا پێویستە بەرنامە و ئامانجێکی رزگاریخوازانەی هەبێ. لام وایە نەبوونی ئەم بەرنامەیە بزوتنەوەکەی تووشی تەنگوچەڵەمەیەکی فیکری کردووە، وەک لە بەشێکی تردا باسی دەکەین.

لەئەنجامی تەنگوچەڵەمەدا بەرای من ناکۆکییەکی نێوخۆیی لە نێوان ناوەرۆک و ئامانجی بزوتنەوەکە، وەک بزوتنەوەیەکی رزگاریخوازی نیشتمانی و لە نێوان سروشت و ئامانجی لایەنە خۆییەکەیدا سەری هەڵداوە چونکە ئەم لایەنە ئامرازە خۆییە لە جیاتی ئەوەی پاڵپێوەنەر

و گەشەپێدەری بزوتنەوەکە بێ بۆتە چەپەر و ڕێگر لەبەردەم بەرە و پێشچوونی سروشتییانەیدا- بەواتایەکی دی ناکۆکی نێوخۆی بزوتنەوەکە لەوەدا خۆدەنوێنێ کە ئامرازە حزبییەکەی/ سەرکردایەتییەکەی لەجیاتی ئەوەی بزوتنەوەکە بە ڕێبازە سروشتییەکەی خۆیدا ببوە و ئامانجە مێژووییەکەی، کە مافی بڕیاردانی چارەنووسە، بەرێ ئەوا بەرەو ئامانجی لاوەکی جڵەوکێشی دەکات و سروشتی خۆهەڵپەسێرانەی خۆی پێوە دەلکێنێ. هەروا سەرجەمی ناوەرۆک و ئامانجی ڕزگاریخوازی نیشتمانی لە هەندێ داخوازی و ئامانجی دیموکراسی و دەستکەوتی تەسکدا چڕ دەکاتەوە. لێرەوە جەوهەر و ناوەرۆکی ڕزگاریخوازی نیشتمانی لە بزوتنەوەکە دادەڕنێ و دەکرێتە بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی تەنگەبەر و بەشێک لە مەسەلە دیموکراتییەکانی تری نێو ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە، وەک مەسەلەی ئافرەتان، مەسەلەی زەوی و زار و.....هتد. لە کاتێکدا جیاوازییەکی جۆنایەتی لە نێوان قۆناغی مێژوویی ئەمڕۆی گەلی کورد و ئەو گەلانەدا هەیە. چونکە ئەوان لە مێژە ئەو ناکۆکییە دەرکییەیان چارەسەرکردووە کە لە نێوان ئەوان و دەسەڵاتی سیاسی نەتەوەی بە هێزتری بێگانەدا هەبوو. ئەمڕۆ ئەو نەتەوانە، سەرەرای جیاوازی رادەی گەشەکردنی کۆمەڵایەتییان لە قۆناغی سەرمایەداری پەیرەو (الرأسمالیه التابعه)دا دەژین. لە کاتێکدا گەلی کورد هێشتا لە سەرەتای قۆناغی ڕزگاریخوازی نیشتمانیدایە و، مەترسی سامناک هەڕەشە لە سەرجەمی بوونی نەتەوەیی دەکات. پێم وایە بەبێ چارەسەرکردنی ئەم ناکۆکییە نێوخۆییە ئاسان نییە بزوتنەوەکە بتوانێ ناکۆکییە دەرەکییەکە، واتا

ناکۆکی نێوان نەتەوەی کورد و دەسەڵاتی چەوسێنەری نەتەوەی بێگانە، چارەسەربکات کە بزوتنەوەکە وەک دیاردەیەکی مێژوویی لە ئەنجامی ئەم ناکۆکییە دەرەکییە و بە ئامانجی چارەسەرکردنی لە دایک بووە.

*با عێراق بۆ نموونە بهێنینەوە:*

ئەو کاتەی گەلانی عێراق لەژێر دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزمی بەریتانیادا بوون ئەمانجی هەردوو بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی عەرەب و کورد لە عێراقدا ئەوەبوو ناکۆکی نێوان ئەم بزوتنەوەیە و نێوان دەسەڵاتی داگیرکەری بێگانە چارەسەر بکات. ئازادبوونی عێراق لە چنگی کۆلۆنیالیزم ئەم ناکۆکییەی بۆ گەلی عەرەب لە عێراقدا چارەسەرکرد. بەڵام ئایا ناکۆکی نێوان گەلی کورد و نێوان دەسەڵاتی بێگانە چارەسەرکرا؟ ئایا ئەو دەسەڵاتە نوێیەی جێگای دەسەڵاتی پێشووی گرتەوە، بە حوکمی ناوەرۆکی شۆڤێنستانەی و خاسیەتی ئاسیاییانەیەوە، درندانەتر لەگەڵ گەلی کورد رەفتار ناکات؟.

کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا لە گەرمەی داگیرکردنی عێراقدا ئەو مەترسییەی بۆسەر بوونی نەتەوەیی گەلی عەرەبی عێراق نەبوو کە ئەمرۆ دەسەڵاتی شۆڤێنی تورک و عەرەب و فارس بۆسەر بوونی نەتەوەیی گەلی کورد هەیانە. چونکە مەسەلەی تواندنەوەی گەلی عەرەب و بە ئینگلیزکردنی وڵاتەکەی لە گۆڕێدا نەبوو. گەلی عەرەبی عێراق لە سایەی داگیرکەردا رووبەرووی ئەو مەترسییە نەبۆوە- بۆ نموونە- کە گەلی عەرەبی ئەلجەزایر لە سایەی کۆلۆنیالیزمی فەرەنسادا تووشی هاتبوو. چونکە خودی بەریتانیا دەوڵەتەکەی وەک دەوڵەتێکی عەرەبی داناشی و لەوەش زیاتر بە زەبری گوللە و نیزەی

سەرپاکەی خۆی کوردستانی خوارووشی پێوەلکاند. هەروا زمانی عەرەبی لە هەموو بوارەکانی خوێندن و نووسین بەکار هێناندا زمانی ڕەسمی بوو. سروشتی کۆلۆنیالیزەکردنی عێراق تەواو جیاواز بوو لە سروشتی کۆلۆنیالیزەکردنی ئەلجەزایر. چونکە کۆلۆنیالیزمی فەرەنسا هەر بەوە نەوەستابوو و وڵاتەکە تاڵان بکات و بیکاتە بازارێکی داخراوی خۆی بەڵکو دەیەویست بە درندانەترین شێوە خەڵکی ئەلجەزایر لەنێوخۆیدا بتوێنێتەوە و خاکەکەشی بکات بە بەشێک لە نیشتمانی (پیرۆز)ی خۆی. ئایا چ جیاوازییەک لە نێوان سروشتی داگیرکردنی ئەلجەزایر لەلایەن بورجوازی فەرەنسا و، سروشتی داگیرکردنی کوردستان لەلایەن بورجوازی تورک و عەرەب و فارسەوە هەیە؟ ئایا مەترسی بورجوازی ئەم نەتەوانە بۆسەر بوونی نەتەوەیی کورد دەقات زیاتر نییە لە مەترسی دوێنێ کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا بۆسەر گەلی کورد. (ڕەنگە بەراوردێکی هەڵە نەبێ لەگەڵ گەلی فەلەستینیدا کە مەترسی ئەمڕۆی دەوڵەتی ئیسرائیل بۆسەر خاک و بوونی نەتەوەییان دەقات لە مەترسی دوێنێ کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا زیاترە. لام وایە لە هەردوو حالەتەکەدا دەکرێ ڕەحمەت بۆ کۆنەکان بنێردرێ).

تۆبڵێی قەناعەتە چەوتە کۆنەکان و تەمبەڵی فیکری و دۆگماتیزم زاتی ئەوەیان لێبڕیبین کە دەرک بە سروشتی سیاسی،ئابووری و کولتووری داگیرکراتی کوردستان نەکەین؟ یان ئەمە بە مەبەستی دڵڕازی کردنی ناسیۆنالیزمی ئەم نەتەوانەیە؟ یاخود کەوتنە ژێر کارتێکردنێکی بێ ئاگایانەی بیری شۆڤێنیستیە کە لەو وڵاتانەدا بە شێوەیەکی سامناک پەرەی گرتووە!!

داگیرکردن، لە سادەترین مانایدا ئەوەیە نەتەوەک/ دەوڵەتێکی بەهێز دەست بەسەر خاک و وڵاتی نەتەوەیەکی تردا بگرێ و، بە دوور لە ویست و ئیرادەی نەتەوەی ژێردەست و، بە زەبری هێز و داپلۆسین و تیرۆر جۆری ڕژێمی سیاسی و ئابووری و شێوەی حوکم و زمان و کولتوور و شێوەی ژیانی خۆی بەسەردا بسەپێنێ و سامان و خێر و بێری وڵاتەکەشی بە تالان ببات، یان ئەم سامانە ملکەچی بەرژەوەندی و ئامانجەکانی خۆی بکات.

بورجوازی دەسەڵاتداری ئەو نەتەوانە تەنیا بە شێوە کلاسیکییەکەی داگیرکردن و کۆلۆنیالکردنی کوردستانەوە نەوەستاون بەڵکو خاسیەتێکی شۆڤێنی- ڕەگەزپەرستانەیان لێزیاد کردووە چونکە دەیانەوێ نەتەوەی کورد لە چوارچێوەی نەتەوەکەی خۆیاندا بتوێننەوە...... دەیانەوێ لایەنی دیرگرانی نیشتمانەکەی لێکەن و تاقەتایە بیکەن بە بەشێکی (پیرۆز)ی نیشتمانی خۆیان. ئەو ناوچانەیش کە ئەمڕۆ ناتوانن بە ئاسانی و پەلەپەل زەوتی بکەن (بۆنموونە ئێستا لە عێراقدا)، ئەوا کاول و وێرانی دەکەن و نایەڵن بە موڵکی کورد بمێنێتەوە.

لێرەوە هێشتنەوەی مەسەلەی کورد بە مەسەلەیەکی نێوخۆی ئەو وڵاتانە و راپێچ کردنی رووە و ئامانجی لاوەکی و بە دوور لە سروشتەکەی خۆی، هەڵەیەکی مێژووییە و فاکتەرێکە دەبێتە هۆی چەواشەکردن و وره بەردانی خەڵکی کوردستان و سڵکردنەوەی لە داوای مافە ڕەواکانی خۆی. ئەم دیاردەیە لە بنچینەشدا، لە لاوازی ئامراز/لایەنە خۆییەکەی بزوتنەوەکە تەک لە سروشت و خاسیەتەکانی بزوتنەوەکەوە هەڵقوڵاوە، بۆیە بە ناوەرۆکی بزوتنەوەکە نامۆیە.

مەسەلەی کورد لەهەر بەشێکی کوردستاندا تەنیا مەسەلەیەکی نێوخۆیی ئەو وڵاتانە نییە کە کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە تا بە جۆرێکی میکانیکیانە بە مەسەلەی دیموکراسی ئەو وڵاتانەوە گرێ بدرێ، لەکاتی پێویستیشدا بکرێتە قوربانی دیموکراسییەکی نیوەچڵ و ساختە. ئەم مەسەلەیە مەسەلەیەکی هەرێمی و جیهانیشە. دووبارەکردنەوەیەکە زیانبەخش نییە ئەگەر بڵێم هەرێمییە چونکە لەهەر پارچەیەکی کوردستاندا بەشێکە لە مەسەلەی نەتەوەیەکی ٢٥ ملیۆنی. جیهانیشە چونکە پەیوەندی بە مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ و مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەلانەوە هەیە، هەروا پەیوەندی بە تاوانی پڕ لە شوورەیی جینۆسایدەوە هەیە کە ئەمانە بەشێکن لەو ماف و خاڵانەی لە دەستوور و یاسای نەتەوەیەکگرتووەکان و لایحەی مافی مرۆڤدا، وەک مەسەلەی جیهانی هاتوون و لە رووی یاسایی و سیاسی و ئەخلاقییەوە سروشتێکی جیهانییان وەرگرتووە.(٢) راستە بزوتنەوەی گەلی کورد پەیوەندییەکی پتەوی بە بەزوتنەوەی دیموکراتی و شۆڕشگێڕی ئەو وڵاتانەوە هەیە کە گەلی کورد لە نێو سنوورەکانیاندا دەژی بزوتنەوەی دیموکراتی ئەو گەلانە هەر دەسکەوتێکی چنگ بکەوێ راستەوخۆ کاردەکاتە سەر گەلی کورد و یارمەتی دەدات برینەکانی تیمار بکات. بۆیە هاریکاری و هاوپەیمانی نێوان هەردوو بزوتنەوەکە مەسەلەیەکی گرنگ و پێویستە، بە مەرجێک ئەم هاوپەیمانییە لەسەر بنچینەی یەکسانی و داننان و باوەڕبوون بە ماف و ئامانجەکانی یەکتری دامەزرابێ. بەڵام کارێکی ناریالیستی و بگرە هەڵەیە ئەگەر چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد بە جۆرێکی ئۆتۆماتیکیبانە بە مەسەلەی دیموکراتییەوە گرێ بدرێ. چونکە ئەگەر

بونی دیموکراسی راستەقینە- کە دیارە لە شێوە ئاسیاییەکەیدا دەبێ- مەسەلەکانی وەک مەسەلەی ئافرەت و زەوی و زار.....هتد چارەسەر بکات، ئەوا مەرج نییە بتوانێ مەسەلەی کورد بە جۆرێکی رەوار دادپەروەرانە و، بەو جۆرەی گەلی کورد لەو قوناغە چارەروانکراوەدا دەیخوازێ، چارەسەر بکات. بگرە لە وانەیە بونی دیموکراسی راستەقینە مەسەلەی کورد بە جۆرێکی تر بهەژێنێ و، خەڵکی کوردستان، لە بارودۆخێکی ئازاددا، بەیەک دەنگ و یەک ئیرادەوە داوای مافی بریاردانی چارەنووس بگرە داوای دەوڵەتی نەتەوەیش بکەن.

باشە کام دیموکراسی داهاتوو دەتوانێ دەیان وسەدان ساڵ داچۆڕاتی ئابووری و کاولکردنی کوردستان بۆ گەلی کورد عەویزە بکاتەوە؟ کام دیموکراسی دەتوانێ نیوەی سەرراستی کوردستانی بە عەرەب کراوی عێراق بۆ گەلی کورد بگێڕێتەوە؟! بۆیە بە رای من دەبێ ئەو ئیحتماله لەبەرچاو بگیرێ کە ناکۆکی، تەنانەت ناکۆکی توند، لە نێوان دیموکراسی چاوەروانکراو لە هەریەکێک لەو وڵاتانە و، لە نێوان بزوتنەوەی گەلی کورددا سەرهەڵبدات. ئەم ناکۆکییەش لەسەرێکەوە پەیوەندی بە سروشت و ئامانجەلێک جیاوازەکانی هەردوو بزوتنەوەکەوە هەیە، لە سەرێکی دیکەوەشەوە پەیوەندی بە تاقی کردنەوەی تاڵی مێژوویی دەیان و سەدان ساڵەی گەلی کورد و وێرانکردن و گۆڕینی لایەنی دیمۆگرافی کوردستان و سیاسەتی لەناوبردنی بە کۆمەڵەوە هەیە کە رژێمە نەتەوەییە شۆڤێنیستەکانی ئەو وڵاتانە پەیرەوی دەکەن. پەیوەندی بە هەڵوێستی هێز و خەڵکی نەتەوەکانی ترەوە هەیە کە کوردستان بە موڵکی خۆیان و میراتی

باپیرانیان دەزانن. پەیوەندی بە چۆنیەتی ئەو پەیوەندییە لاسەنگ و ناپەکسانەوە هەیە کە لەسەرەتاوە لە نێوان ئەو نەتەوانە و نەتەوەی کورددا دروست کراوە و، ئەمرۆ تەواو وەک پەیوەندی نێوان جەللاد و کەسێکی زیندانی کراوی لێهاتووە. بۆیە کارێکی چاوەروانکراو و روایە نەتەوەی کورد لە هەوەڵین دەرفەتێکی لەبار و گونجاودا ئەم پەیوەندییە بە توندی رەت بکاتەوە و، لەهەر بەشێکی کوردستاندا بێ، بەیەک دەنگ و یەک ئیرادەوە بۆ مافی بڕیاردانی چارەنووس رابێ.

چەند ساڵێکی کەم پێش ئێستا کێ چاوەروانی دەکرد زۆربەی نەتەوە خاوەن کۆمارە فیدراڵییەکانی یەکێتی سۆڤیەت، کە رەنگە لەسەدا یەکی نەتەوەی کورد ئەوهێنی نەتەوەییان پێنەکرابێ، ئاوەها جۆرە رابێن و داوای جیابوونەوە وەک خۆیان دەڵێن لە داگیرکەری رووس بکەن؟

لەلایەکی دیکەوە بە هۆی ئەو بارودۆخە سەختەی نەتەوەی کوردی تێدا دەژی و بە هۆی ئامادەیی خەڵکی کوردستان بۆ خەبات لە پێناوی مافەکانیدا، دەرفەتێکی بابەتی لەبار، لەهەر بەشێکی کوردستاندا هەیە کە بارودۆخی شۆرشگێڕی بەر لە ناوچەکانی تر پێبگات و، مەسەلەی کورد رووە و ئاسۆیەکی نوێ هەنگاو بنێ و ئەتوانێت بە مافی بڕیاردانی چارەنووسیش بگات بەر لەوەی بزوتنەوەی دیموکراتی لەو وڵاتانەدا سەربکەوێ.

بۆیە بەستنەوەی چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد تەنیا بە بوونی دیموکراسییەوە بۆچوونێکی کورتبینانە و هەڵەیە، نەک تەنیا لەبەر ئەوەی لە ئاکە گۆشەیەکی دیاریکراو بۆ سەرجەمی مەسەلەی کورد

دەروانێ، بەڵکو لەبەر ئەوەش بزوتنەوەی دیموکراتی ئەو وڵاتانە بە حوکمی ناوەرۆک و خاسیەتی شۆڤێنی هێز و لایەنەکانی ناتوانێ مەسەلەی گەلی کورد بە جۆرێکی رەوا چارەسەر بکات. زۆربەی هێزەکانی نێو ئەم بزوتنەوەیە هێزی ناسیونالیستی نەتەوەی گەورەن و شۆڤێنیزم لە نێوخۆیانیاندا دەژی. ئەوەتا لەوپەری لاوازی و شکستیدان کەچی ناتوانن دان بە مافی چارەنووسی گەلی کورددا بنێن و، بێنە سەر ئەو باوەرەی کە یەکێتی نەتەوەکان دەبێ لەسەر بناخەی مافی بەرامبەر و بە جۆرێکی ئارەزومەندانە نەک بە زۆرەملی دابمەزرێ. لەلایەکی دیکەوە حزبەکانی چینی کرێکاری ئەو وڵاتانە هێشتا لاواز و تێکشکێندراون و رۆڵی سەرەکییان لە نێو بزوتنەوەی دیموکراتیدا نییە، سەرەرای ئەوەی لە شۆڤێنیزمی بورجوازی دەرباز نەبوون و نەیانتوانیوە شارستانییانە و ئینسانییانە سەرلجی مەسەلەی کورد بدەن و بەو جۆرە لە مافی بریاردانی چارەنووس بگەن کە نەک هەر تەنیا مافێکی رەوایە بۆ هەموو گەلان بەڵکو بەو پێیەش یەکێتی نەتەوەکان ئەو کاتە دێتەدی کە لەسەر بناخەی دیموکراسی و ئینترناسیونالی بێ و مافی جیابوونەوەی تێدا بپارێزرێ.

جانەگەر بزوتنەوەی دیموکراسی ئەو وڵاتانە، لە کاتێکدا تێشکاوە هێندە لوتبەبەرزانە و ناوا بە سوکی سەیری مەسەلەی کورد بکات، ئاخۆ سبەینێ کە ئەم بزوتنەوەیە دەسەڵاتی سیاسی دەگرێتە دەست و هەموو ئامرازەکانی داپلۆسینی لەژێر دەستدا دەبێ چۆن چۆنی مەسەلەی کورد چارەسەر دەکات؟

ئەوانەی ئەمرۆ، لەکاتی زەبوونییاندا مافی بریاردانی چارەنووس و سەربەخۆیی نیشتمانی بە گەلی کورد رەوا نابینن، سبەینێ کاتێ

دەسەڵاتدار دەبن و گەلی کوردیش داوای ئەم مافە دەکات کێ دەڵێ ئەمانە لە حوکمڕانەکانی ئەمڕۆ باشتر وەڵامی گەلی کورد دەدەنەوە.

مەسەلەی کوێلەکردن و بریندارکردنی کەرامەتی نەتەوەیی و زەوت کردن و خۆ بە خاوەن زانینی خاکی نەتەوەی تر و سەرجەمی چارەنووسی نەتەوەی ژێردەستە زۆر لەوە ئاڵۆزتر و سامناکترن کە بە هەندێ بڕیاری ئەو تێزی نیوەچڵ و حیساب بۆ کراوی ئەوتۆ چارەسەر بکرێن، کە لە بنچینەدا دڵڕاگرتنی نەتەوەی چەوسێنەر و بگرە بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی چەوسێنەر، نەک چەوساوە، لەبەرچاو بگرێ. ئەوەتا وڵاتانی وەک رۆمانیا و مەجەرستان، یوگۆسلاڤیا و بولگاریا دوای زیاتر لە چل ساڵ بەسەر دەسەڵاتی گوایا کرێکاراندا کەچی ئاتێستا لەسەر چەند پارچە خاکێک تیر و شیر لە یەکتری دەسوون. ئەگەر بوونیان لە پەیمانی وارشۆ و مەترسی ناتۆ و رۆڵی پۆزەتیڤانەی یەکێتی سۆڤیەت نەبوایە لەوانە بوو چەند ساڵ لەمەوبەر پێکیان دابێتایە...... مەسەلەی چەند ناوچەیەکی سنووری ئاتێستاش یەکێکە لە گیروگرفتەکانی نێوان دوو وڵاتی بەرینی وەک یەکێتی سۆڤیەت و چین. لەوەش زیاتر ئەوە تا هەردوو نەتەوەی ئازەر و ئەرمەن دوای حەفتا ساڵ پەروەردەکردنی گوایا ئینتەرناسیونالی و سۆسیالیستی، ئاوا بەربەریستانە تێک بەربوون و خوێنی ژن و پیر و زارۆکی یەکتریان حەڵاڵ کردووە. دەوڵەتی بولگارستان دوای نزیکەی سەدوودەساڵ ئازادبوونی لە کۆلۆنیالیزمی تورک، سەرکردایەتی گوایا پرولیتاری ژیڤکۆڤ تۆڵەی رابردووی لەو تورکانە کردەوە کە لە بولگاریا دەژین، چونکە هێشتا گرێ کوێرەی کۆیلایەتی دوێنێ و بریندارکردنی کەرامەتی نەتەوەیی لەنێو سایکۆلۆژیای کۆمەڵایەتی

بەشێکی خەڵکی ئەو وڵاتەدا ریشەی داکوتاوە. من کە باسی ئەم دیاردانە دەکەم بە کارێکی سروشتییان نازانم. نەخێر بە کارێکی ناپەسند و نارەوایان دادەنێم. بەڵام نارەوایی دیاردەیەک بووتە بابەتیەکەی لەتاوناباتە. لێرەدا دەمەوێ سەرنج بۆ ئەوە رابکێشم کە ئەگەر ئەم مەسەلانە هێندە ئاڵۆز و سامناک بن و هەروا تەنانەت لە بەرنامە سیاسیەکانیشدا بەبێ چارەسەرکردنی ریشەیی بمێننەوە ئاخۆ لە دوارۆژی نزیکدا- لای خۆمان- چ جەنگێکی سامناکی نێوخۆ و چ لافاوێکی خوێنینی سامناکتر چاوەڕێمان بکەن!! - ئەوکاتەش هەموو لایەک بەرپرسیاری ئەو کارەساتە دەبن!.

چەوساندنەوە و کۆیلەکردنی دەیان و سەدان ساڵەی نەتەوەییش و زامدارکردنی کەسایەتی و کەرامەتە نەتەوەییەکەی جۆرە بیر و بۆچوون و هۆشیاری کۆمەڵایەتی و کاردانەوەی رۆحی ئەوتۆ لای نەتەوە ژێردەستەکە دەخوڵقێنن کە دەستاوبرد لەگەڵ نەمانی چەوسانەوە و کۆیلەیەتییەکەدا وا بە ئاسانی لەناو ناچن و لەبیر و هۆشیاری خەڵکیدا ناسڕدرێنەوە، بەڵکو بە حوکمی سەربەخۆییە نیسبییە بەناوبانگەکەی هۆشیارییەوە (الوعي) تا سەردەمێکی زۆر دەمێننەوە و، لەگەڵیدا ئەو دەرفەتەش دەمێنێ کە هێزێکی کۆمەڵایەتی سیاسی، تەنانەت چەندان ساڵ دوای نەمانی چەوسانەوەکەش، ئەم مەسەلەیە بۆ دوژمنایەتی نەتەوەیی و جۆشپێدانی ڕقی نەتەوەیی بەکاری بێنێ- چونکە ئەم ژێردەستی و کۆیلەیەتییە لەگەڵ خۆیدا هەزاران قوربانی و کارەسات و ماڵوێرانی هێناوە، کە لە واقیعە مادییەکەدا لەژێر هەر دەرخت و دەوەن لەپاڵ هەر بەرد و گوێ رووبار و لەنێو هەر کۆڵان و گەرەک و گوند و

شارێکدا شوێنەواریان دەمێنێ و ڕۆژانە بە زەقی ڕووبەڕووی خەڵکەکە دەبنەوە..... لە ژیانە ڕۆحییەکەشدا لە نێو سەدان گۆرانی و بەیت و لاوک و حەیران و هۆنراوە و داستان و چیرۆک و ڕۆمان و لایلایلایەی دایکان سەرجەمی کولتووری ڕۆحیدا بە زیندوویی دەمێننەوە و لەنێو نەفسییەت و هۆشیاری کۆمەلایەتی و کەسایەتی خەڵکی نەتەوەکەدا ڕیشەیان دادەکوتن.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان


١- لینین - تەواوی دانراوەکان- بەرگی ٢٥ ل. ٢٥- بە زمانی بولگاری.

٢- بۆ زیاتر دەربارەی لایەنی یاسایی جیهانیی بوونی مەسەلەی کورد، بڕوانە وتارێکی دکتۆر فوئاد ساکۆ، گۆڤاری ڕێگای ئاشتی و سۆسیالیزم - ژمارە ١٢- وتارێکی د. پیری شاڵیار- کوردستان الیوم- ژمارە ٤. ٥ کانوونی دووەم و شوباتی ١٩٨٩.

بەشی دووەم

# میکانیزمی پەیوەندی نێوان بزوتنەوەی کورد و بزوتنەوەی نەتەوەکانی ناوچەکە

پەیوەندی نێوان بزوتنەوەی کورد و بزوتنەوەی ئەو گەلانەی تەمرز نەتەوەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتێکدا لەگەڵیان دەژی پەیوەندییەکی مێژووییە و لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەو بزوتنەوانە و لە گەرمەی خەبات لە پێناوی ئامانجی هاوبەشدا وەک پێداویستیەکی بابەتی لە دایک بووە.

ئەم پێوەندییە لە پرۆسەی بەرەوپێشچوونیدا بە قۆناغی مێژوویی جۆربەجۆردا تێپەریوە. کۆمەڵێک ئالوگۆری چۆنایەتی بەسەرداهاتووە کە لە بنچینەدا رەنگدانەوەی گۆرانکارییەکانی نێو ئەم بزوتنەوانە و ئامانجە جۆربەجۆرەکانیان بووە. لە هەر قۆناغێکیشدا ئەوەندەی ئامانجەکانی بزوتنەوەی هەریەک لەو گەلانە لەگەڵ ئامانجەکانی بزتنەوەی کوردا هاوجووت یان هاوبەش بووبن ئەوا ئەم پەیوەندییەش روالەتێکی پۆزەتیڤانە و چالاکانەی بە خۆوەگرتووە و، لە مەیدانی خەباتی هاوبەشدا سەرکەوتنی بەرچاو هاتوونە دی.

لەهەمان کاتدا ئەم پەیوەندییانە کۆمەڵێک پەند و دەرسی تاڵیشیان بۆ گەلی کورد جێهێشتوو ن کە لە خەباتی ئێستا و داهاتوودا ناکرێ

لەبەرچاو نەگیرێن. چونکە لایەنەکان و سەرکردایەتی بزوتنەوەی نێو ئەو نەتەوانە لە رۆژانی تەنگانەدا، کاتێ لاواز و زەبوون و راوترابوون، ئەوا هاریکاری بزوتنەوەی گەلی کوردیان بەلاوە مەبەست بووە، چونکە پێویستیان پێ بووە تا بۆ گەیشتنە ئامانجەکانی خۆیان سوودی لێوەربگرن. کاتێکیش بە هەوڵێن ئامانجەکانیان گەیشتوون، بە هۆی ناوەرۆکی ناسیونالیستی و شۆڤێنیستییانەوە، پشتیان کردۆتە گەلی کورد و نەک تەنیا لەگەلیدا بەڵێن شکێن و بێ وەفا دەرچوون بەڵکو یەکسەر نیازە شۆڤێنیستییەکانی خۆشیان بەرامبەری دەرخستووە.

## ئاوردانەوەیەکی مێژوویی

لام وایە کۆنترین پەیوەندی تونی نێوان نوێنەرانی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد و بزوتنەوەیی ئەو گەلانە بۆ کۆتایی سەدەی رابردوو و سەرەتای ئەم سەدەیە دەگەڕێتەوە. کاتێ نیشتمانپەروەرانی کورد و تورک، دواییش لەگەڵ نیشتمانپەروەرانی عەرەب، لە ئاوارەییدا خەباتی سیاسی و کولتووری هاوبەشیان لە دژی ئیستیبدادی سوڵتانی عوسمانی دەکرد و، لەژێر کارتێکردنی بیری رۆشنگەری (التنویر) و شۆرشە دیموکراسییە بورژوازییەکانی ئەوروپادا بانگی ئازادی، دادپەروەری و یەکسانییان دەدا و دەیانویست ئەو بیروباوەڕە نوێیانە لە کۆمەڵگای عوسمانیدا بڵاوبکەنەوە، کە لە جەوهەردا لەگەڵ گەشەکردنی ژیانی کۆمەلایەتی و سەرەتاکانی دەرکەوتنی پەیوەندی بابەتی نوێی سەرمایەداری لەنێو ئەو کۆمەڵگایانەدا دەگونجان.

لەو سەردەمەدا نیشتمانپەروەران و دەستەی رۆشنبیری نوێی کوردستان لە دەرەوە بەشداری چالاکانەیان لە خەباتی دژ بە سوڵتاندا

دەکردو، هەندێکیان ڕۆڵی سەرکردایەتییان لەنێو ڕێکخراوی (تورکیای لاو)دا هەبوو، [بۆ نموونە عەبدوڵلا جەودەت ئەندامی یەکەمین دەستەی دامەزرێنەری ئەم ڕێکخراوە و بەرپرسیاری یەکێک لە ڕۆژنامەکانی ڕێکخراوەکە (إجتهاد) بوو].

لەساڵی ١٩٠٨دا کاتێ ڕێکخراوی تورکیای لاو سەرکەوتنی وەدەستهێنا، لەسەرەتادا، کە هێشتا ناسیۆنالیستی تورک دەسەڵاتی خۆی نەچەسپاندبوو، دەرفەتێکی بابەتی و جۆرە ئازادییەک بۆ نیشتمانپەروەرانی کورد ڕەخسا توانییان کۆمەڵێک چالاکی سیاسی و کولتووری فراوان لە کوردستانی باکووردا بنوێنن و هۆشیاری نەتەوەیی بڵاوبکەنەوە و بزوتنەوەی گەلی کورد بەرەوپێشەوە بەرن.

تورکیای لاو هەر لە یەکەمین ڕۆژانی سەرکەوتنیاندا ناوەرۆک و نیازە شۆڤێنیستییەکانی خۆیان بەرامبەری نەتەوە غەیرە تورکەکان نەشاردەوە. بۆیە لە پایزی هەمان ساڵدا نیشتمانپەروەرانی کورد ڕێکخراوی خۆیان بە ناوی (کۆمەڵەی تەعالی و تەرەقی کورد) یەوە پێکهێنا و، چالاکی سیاسی و کولتووری خۆیان درێژەپێدا. زۆری نەخایاند ناسیۆنالیستانی تورک هێرشی داپلۆسینی بەربڵاویان کردە سەر کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان و کەوتنە ڕاونان و گرتنی نیشتمانپەروەران. تەنانەت بە ماوەیەک بەر لە هەڵگیرسانی یەکەمین شەڕی جیهانی تەواوی ئەو چالاکییە سیاسی و کولتوورییە ئاشکرایانە دامرکێندرانەوە.

کاتێکیش کەمال ئەتاتورک دەسەڵاتی گرتە دەست، لەژێر پاڵەپەستۆی ئەو گیروگرفتانەی دوای تێکشکانی ئیمپراتۆری عوسمانی لە جەنگدا ڕووبەڕووی تورکیا ببوونەوە، کۆمەڵێک گفت و

بەڵێنی بە نەتەوەی کورددا کە لە پەیماننامەی نیشتمانی ساڵی ۱۹۲۰دا تۆمارکران. بەڵام کاتێ بە هاریکاری گەلی کورد تراتی خاکی تورکیا لە هێزی بێگانە دەربازیکات تەک هەر لە بەڵێنەکانی، کە بە گەلی کوردی دابوون، ژێوان بۆوە بەڵکو توانی پەیمانی سێڤەریش، کە هەندێ بەندی گرنگی سەبارەت بە مافەکانی گەلی کوردی بە خۆوەگرتبوو، هەڵوەشێنێتەوە و لە ساڵی ۱۹۲۳ دا پەیمانی لۆزان، کە کەم و زۆر باسی مافی گەلی کورد ناکات، جێگەی بگرێتەوە.

کاتێکیش خەڵکی کوردستان بە سەرۆکایەتی شێخ سەعیدی پیران داوای مافی نەتەوەیی خۆیان کرد، ناسیۆنالیستانی تورک کە ئەو کاتە لاقی بەربەرەکانی ئیمپریالیزمیان لێدەدا، بە جۆرێکی درندانەی کەم وێنە وەڵامی گەلی کوردیان دایەوە هەر بەم دروشمە ساختەیەش توانییان دەسەڵاتی سۆڤیەت بە ئەندازەیەک گومرا بکەن کە دژی بزوتنەوەی کورد بوەستێ.ئەم کارە هێندە درندانە بوو کە (ئەفرزی) سەرسام کرد بەدەنگی بڵند بڵێ: (بەراستی سەیرە! نەتەوەیەک کە تادوێنێ دیفاعی لە مافی خۆی دەکرد، ئێستا دەستدرێژی بکاتە سەر مافی نەتەوەیەکی تر و خەباتی رزگاریخوازی بکاتە خەبات بۆ ژێر دەستکردنی گەلانی تر.[1]

لە عێراقیشدا پەیوەندی نێوان بزوتنەوەی هەردوو نەتەوە بۆ رۆژانی بەرگریکردنی کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا دەگەرێتەوە کە گەلی کورد لە راپەرینەکەی ساڵی ۱۹۲۰ی خەڵکی عێراقدا بەشدارییەکی فراوان و چالاکانەی کرد.[2]

لە ساڵی ۱۹۲٤ بە دواوە کاتێ کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا حوکمداری

ساوای کوردستانی روخاند و کوردستانی به دەوڵەتی کارتۆنی عێراقەوە گرێدا، توانی زیاتر دەسەڵاتی خۆی بەسەر عێراقدا بسەپێنێ و، لە رێگەی کۆمەڵێک رێکەوتن و پەیماننامەی نابەرابەرەوە دەوڵەتی عێراق زیاتر وابەستەی خۆی بکات و خەڵکەکەش سەخت تر بچەوسێنێتەوە.

لە ئەنجامدا کۆمەڵێک راپەڕینی جەماوەری لە دژی دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزمی و رژێمی پاشایەتی سەریان هەڵدا، کە لە هەموویاندا نەتەوەی کورد چالاکانە بەشداری کرد لە ئەنجامدا گەلانی عێراق توانییان لە تەمووزی ۱۹۵۸دا رژێمی وابەستە بە کۆلۆنیالیزم بروخێنن و دەوڵەتێکی کۆماری دابمەزرێنن.

بە هۆی ئەم سەرکەوتنەوە گەلی کورد بۆ ماوەی دوو ساڵێک جۆرە ئازادییەکی بۆ رەخسا و، ژیانی سیاسی و کولتووری و نەتەوەیی لە کوردستاندا بووژانەوەیەکی نوێیان بەخۆوە دی. بەلاَم ئەم (مانگی هەنگوینییەی شۆرش) زۆری نەخایەند، چونکە دەسەڵاتی بورژوازی عەرەب، بە جۆرێکی شۆڤێنیستانە کەوتە داپڵۆسینی نەتەوەی کورد بەمەش سەرەتای تێکشکانی شۆرشی تەمووز دەستی پێکرد، چونکە هەر زوو دوابەدوای پەلاماردانی خەڵکی کوردستان، نۆرە هاتە سەر داپڵۆسینی بزوتنەوەی کرێکاران و زەحمەتکێشانی خەڵکی عێراق.(۳)

## هەندێ پەند و تاقیکردنەوە

بزوتنەوەی نەتەوەیی دیموکراتی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە، هەندێ پەند و تاقیکردنەوەی تاڵیان هێناوەتە کایەوە، کە سەرباری چەند بارەبوونەوەیان، کەچی بزوتنەوەی رادیکاڵ و بە

تایبەتی بزووتنەوەی کرێکارانی ئەو وڵاتانە سوودیان لێوەرنەگرتوون.

بزووتنەوەی نەتەوەیی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە کاتێ ناکۆکییە دەرەکییەکەیان لەگەڵ دەسەڵاتی چەوسێنەری بێگانەدا، یان ناکۆکییە نێو خۆییەکەیان لەگەڵ ڕژێمی دیکتاتۆری وڵاتەکەیاندا چارەسەر دەکەن و دەسەڵاتی سیاسی دەگرنەدەست کۆمەڵێک گۆڕانکاری چەندایەتی بەسەر ناوەرۆکە کۆمەڵایەتییەکەیاندا دێت و، بە هۆی خاسیەتی چینایەتی و ناسیۆنالیستیانەوە و بە هۆی لاوازی ڕۆڵی پارتی چینی کرێکاران لە نێو ئەم بزووتنەوانەدا، بەرەبەرە ئەم بزووتنەوانە ناوەرۆکە ڕزگاریخوازی و دیموکراتییەکەیان لەدەست دەدەن. ئەم گۆڕانکارییە چۆنایەتییانەش، بە حوکمی کێشەی نەتەوەیی لەو وڵاتانەدا، بەر لەهەموو شتێک لە هەڵوێستی شۆڤێنیستانەیان بەرامبەر بە مەسەلەی کورد دەردەکەوێ. ئەم هێزانە لە هەرەتی لافلێدانی شۆڕشگێڕی و خەباتی گوایا دژی ئیمپریالیستییاندا نەک هەر نکۆڵی لە مافە نەتەوەییەکانی کورد دەکەن، بەڵکو هەروەڵێ لەشکرێکی پڕ چەکی خۆیان بۆ داپڵۆسینی خەڵکی کوردستان ئامادە و بەرێ دەکەن. لێرەوە، پێم وایە، هەروەڵێ ڕواڵەتی تێکشکانییان وەرچەرخانی ئەم بزووتنەوانە لە هەڵوێستیان بەرامبەر بە مەسەلەی کورد دا دەردەکەوێ. بگرە هەروەڵێ پرۆژەی داپڵۆسین و تیرۆری خەڵکی زەحمەتکێشی وڵاتەکەیان بە داپڵۆسینی خەڵکی کوردستان دەستپێدەکەن، چونکە ئەم هەنگاوە، کە ڕەنگدانەوەی جەوهەرە شۆڤێنیستی و چینایەتییەکەیانە، بۆ ئەوان ئاسانترە و باجەکەشی کەمترە. ئەوان لەم ڕێگەیەشەوە دەتوانن بە دروشمی دیماگۆگییانەی پاراستنی (یەکپارچەیی) خاک و سەروەری

دوزنانەی نیشتمان گیانی شۆڤێنیستی لەنێو نەتەوەکانیاندا جۆش پێبدەن و کۆمەڵانی خەڵکی پێ بەنج بکەن، تا بتوانن ئاسانتر بزوتنەوەی دیموکراتی و کرێکاران و زەحمەتکێشانی وڵاتەکەیان سەرکوت بکەن و تێکی بشکێنن.

ناموێ درێژدادڕی بکەم، بەڵام بابروانین ئەتاتورک دوای داپڵۆسینی خەڵکی کوردستان، رەزاخان دوای لێدانی بزوتنەوەی سمکۆ و دواتریش دوای روخاندنی کۆماری دیموکراتی کوردستان و ئازربایجان، کەریم قاسم دوای هێرشی سوپایی بۆسەر کوردستان، بەعس دوای تێکشکاندنی بزوتنەوەی گەلی کورد لە ساڵی ١٩٧٥ داو، رژێمی ئێستای ئێران دوای هێرشی عەسکەری بۆسەر خەڵکی کوردستان.....

هەر هەموویان هەوەڵین پراوەی داپڵۆسینیان لە کوردستاندا دەستپێکردووە و، دوای ئەوە زەبری توندتریان لە بزوتنەوەی کۆمۆنیستی و سەرجەمی بزوتنەوەی شۆرشگێڕی وڵاتەکەیان داوە.

ئەم دەرسە تاڵانە لەگەڵ ئەوەی لەهەر یەکێک لەو وڵاتانەدا زیاتر لە جارێک دووبارە بوونەتەوە، کەچی بزوتنەوەی چەپ، بە تایبەتی مارکسییەکانی ئەو وڵاتانە لەبەر کۆمەڵێک هۆکار لەبەرچاویان نەگرتوون. ئەوان لە جیاتی ئەوەی هەڵوێستی ئەم رژێمانە بەرامبەر بە مەسەلەی نەتەوەیی و دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ بە بنچینە دابنێن، ئەوا زیاتر دروشم و هاتوهاواری گوایا دژی ئیمپریالیستی ئەم رژێمانە و پەیوەندییان لەگەڵ، یان هەڵوێستیان بەرامبەر وڵاتانی (سوسیالیستی) بۆ ئەوان بوونەتە مەسەلەی سەرەکی، وەک ئەوەی رژێمێک بتوانێ دژی ئیمپریالیزم بێ لە کاتێکدا نەتەوەی کورد لەناو دەبات و دیموکراسی لە کۆمەڵانی خەڵکی زەوت دەکات!!.

بزوتنەوەی نەتەوەیی ئەو وڵاتانە هەر هێندە بە تەنگ کۆمەک و هاوپەیمانی بزوتنەوەی کوردەوە هاتوون کاتێ لە قۆناغی رزگاریخوازی نیشتمانیدا بوون کێشەیان لەگەڵ دەسەڵاتی بێگانەدا بووە یان رووبەرووی تیرۆری رژێمە دیکتاتۆرەکانیان بوونەتەوە. ئیتر دوای ئەوە بزوتنەوەی کوردیان فەرامۆش کردووە و، لە دوژمنە هاوبەشەکەی دوێنێیان درندانەتر پەلاماری گەلی کوردیان داوە.

بۆیە تاقیکردنەوەی بزوتنەوەی کورد لەگەڵ بزوتنەوەی نەتەوەیی و دیموکراسی ئەم وڵاتانە تاقیکردنەوەیەکی تاڵ و تراجیدیانەیە، چونکە پەیوەندییەکانی نێوانیان پشت بە میکانیزمێکی ئیفلیج دەبەستێ و لە بنچینەدا پەیوەندییەکی لاسەنگ و نایەکسانە و زیاتر رەنگدانەوەی ئەو پەیوەندییە بابەتییە نایەکسانەیە کە هەر لەسەرەتاوە لەنێوان نەتەوەی زۆردار و نەتەوەی زۆرلێکراودا هەیە. رەنگدانەوەی هەڵوێستی شۆڤێنیستیانەی هێزەکانی نەتەوەی زاڵە کە کوردستان بە بەشێکی ئەبەدی وڵاتەکەی خۆیان دەزانن و ئەو راستییە ناسەلمێنن کە کوردستان هەر دوێنێ بە دوور لە ئیرادەی گەلەکەی بەسەر ئەم وڵاتانەدا دابەشکراو بە زەبری (ئیستیبدادی ئاسیایی) لەنێو ئەو دەوڵەتانەدا ماوەتەوە.

ئەگەر بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد بەرپرسیاری بەشێکی ئەم میکانیزمە ئیفلیجەبێ، جا لەبەر ئەوەی پێی رازی بووە و مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەلی کوردی نەکردۆتە مەرجی پەیوەندی هاوبەش، یان لەبەر ئەوەی لە هەندێ قۆناغدا خۆی لە بزوتنەوەی دیموکراتی ئەو وڵاتانە و دوورەپەرێز گرتبێ ئەوا بەرای من ئۆباڵی هەرە سەرەکی ئەم مەسەلەیە لە ئەستۆی بزوتنەوەی نەتەوەیی و دیموکراسی

ئەو گەلانە دایە، چونکە ئەوان لەوپەڕی لاوازی و( شۆڕشگێڕ)یباندا نەیانتوانیوە و ناشتوانن دەستبەرداری سروشتی شۆڤێنیستانەی خۆیان بېن و دان بە مافی بڕیاردانی چارەنووسی نەتەوەی کورددا بنێن. لەھەموو زروف و سەردەمێکیشدا بەرژەوەندی خۆیان چەند جار و چەند جار خستۆتە سەرووی بەرژەوەندی سەرجەمی خەڵکی کوردستانەوە. باسکردنی ئەم واقیعە تاڵە بەو مەبەستە نییە هاریکاری نێوان بزوتنەوەی کورد و بزوتنەوەی ئەم وڵاتانە بە کارێکی بێ هوودە دابنێم، بەڵکو بەو ئامانجەیە میکانیزمێکی نوێ بۆ ئەم پەیوەندییانە دابهێندرێ کە لەسەر بنچینەی یەکسانی و مافی بەرابەری و دانان بە مافی بڕیاردانی چارەنوسی یەکتری دابمەزرێ.

داهێناتی ئەم میکانیزمە ئەگەرچی بە بڕیەوە هەیە وزەیەکی نوێ بە بەر خەباتی هاوبەشی بزوتنەوەی کورد و بزوتنەوەی ئەو گەلانەدا بکات، بەلام بەو مانایە نییە کە هەرکاڵەم بزوتنەوە نەتەوەیی و دیموکراتییانە دەتوانێ مەسەلەی کورد بە جۆرێکی رەوار بەو شێوەیەی نەتەوەی کورد دەیخوازێ چارەسەر بکات. ئەمەش بەر لەھەموو شتێک پەیوەندی بە ناوەڕۆک و ئامانجە لێک جیاوازەکانی بزوتنەوەی کورد و ئەو بزوتنەوانەوە هەیە کە رەنگە تەنیا بوونی دیموکراسی ئامانجی هاوبەشی نێوانیان بێ. هەروا پەیوەندی بە کۆمەڵێک هۆکاری ترەوە هەیە کە لە ژمارەی رابردوودا باسی هەندێکیان کرا.

گۆڕینی رژێمی سیاسی هەرکام لەم وڵاتانە، بەهەر رێگەیەک بێ (کۆدیتای عەسکەری، راپەڕینی جەماوەری.....هتد) بارودۆخێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی نوێ دێنێتەکایەوە کە وزەو ئیرادەی

داپلۆسراوی خەڵکی دەهەژێنێ. هۆشیارییەکەی نوێی کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی و سیاسی پێش، یان لەکاتی ئەم پرۆسەیەدا، سەرهەڵدەدات و هەر لە یەکەمین رۆژانی بارودۆخی دیموکراسییەکەدا بە جۆرێکی خێرا بەرەوپێشەوە دەچێ کە ناتوانێ لەگەڵ واقیعە کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەکەدا بگونجێ. چونکە پرۆسە شۆڕشگێڕییەکە بە حوکمی بارودۆخی بابەتی و ناوەرۆکی هێزە کۆمەڵایەتییە سەرەکییەکانی، هەروا بە هۆی شوێنەوار و پاشماوە کەڵەکەبووەکانی رژێمی پێشووەوە ناتوانێ بەو خێراییە داخوازییە کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەکان بهێنێتەدی. لێرەوە ناکۆکی لەنێوان خواستی کۆمەڵانی خەڵکی و دەرەتانی دەسەڵاتە نوێیە سیاسییەکەدا سەرهەڵدەدات.

جا لەبەر ئەوەی سەرهەڵدانی دیموکراسی لەو وڵاتانەدا دیاردەیەکی رێکەوتە نەک پێداویستییەکی بابەتی گەشەکردنی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری و، لەبەر ئەوەی لەم وڵاتانەدا هیچ جۆرە نەریتێکی دیموکراسی نەلە کۆمەڵگا و نەلە نێوان پارتە دیموکرات و شۆڕشگێڕەکان و نەلە نێو خودی هیچ کام لەو پارتانەدا نییە، لەبەر ئەوەی پارسەنگی نێوان هێزە کۆمەڵایەتییە- سیاسییەکان بەو جۆرە نییە کە بتوانێ تاسەر پارێزگاری دەستەبەری ئەو دیموکراسییە ساوایە بکات ئەوا بەڵای زۆرەوە هەر زوو هێزێک- لایەنێکی سیاسی دەرفەت دێنێ و دەسەڵاتە سیاسییەکە زەوت دەکات و، بەپێی یاسای جەنگەڵ لەگەڵ هێزە هاوسەنگەرەکانی دوێنێدا دەجوڵێتەوە. ناکۆکییە نوێیە بابەتییەکەش بە زەبری تیرۆر و داپلۆسینی بەربڵاو خەفەدەکات. دووبارەکردنەوەشە ئەگەر بڵێم پراوەکەش لە کوردستان دەکات و، دەشتوانێ دەسکەوتەکانی گەلی کورد، ئەگەر ئۆتۆنۆمی راستەقینەش

بێ بەسەرە قەڵەمێک زەوت بکاتەوە. چونکە رووی نەداوە دەوڵەتێکی بورژوازی دەرفەتی چەوساندنەوەی نەتەوەیەکی تری بۆ بڕەخسێ و نەیچەوسێنێتەوە.

دواجار تۆبڵێی تێفلیجی میکانیزمی پەیوەندی نێوان بزوتنەوەی کورد و بزوتنەوەی ئەو گەلانە و، تێکۆڵیکردنی هێزە دیموکرات و گۆیا شۆڕشگێڕەکانی ئەو نەتەوانە لە مافی بڕیاردانی چارەنووسی نەتەوەی کورد هەر پەیوەندییان بەو هۆکارە خۆیی و بابەتییانەوە هەبێ کە باسم کردن؟ یاخود ئەمە بەشێک بێ لە سایکۆلۆژیای کۆمەڵایەتی یان سایکۆلۆژیای (قەومی) نەتەوەی گەورە کە بەرادەی جۆربەجۆر کار دەکاتە سەر هەموو هێزە کۆمەڵایەتییە- سیاسییەکان و، لەو وڵاتانی فرە نەتەوەدا هەرکام لە هێزە کۆمەڵایەتییەکانی نەتەوەی گەورە، بە مارکسییەکانیشەوە کاتێ دەسەڵاتی سیاسی دەگرنەدەست، بە رادەی جۆربەجۆر، شۆڤێنیستانە لەگەڵ نەتەوە بچوکەکانی وڵاتەکانیان رەفتار دەکەن و، خۆیان لەچارەسەرکردنی رەوار ریشەیی مەسەلە نەتەوەییەکان دەدزنەوە؟! ئەمەیان بۆ خوێنەران جێدێڵم و هەر هێندە دەڵێم تاقیکردنەوەی وڵاتانی سۆسیالیستی کە دەبوایە لەم رووەوە نموونەبن، دەریان خست کە سایکۆلۆژیای قەومی نەتەوەی گەورە و خۆ بەزلزانینی دیاردەیەکی چەند سامناکە.

## پەراوێزەکان

١- ج.ل. تەحرز (تاوڕێک بۆ سەر مێژووی جیهان) لە کتێبی کوردستان وکورد- قاسملو وەرگێڕاوە. ل٥٩.

٢- بۆ زیاتر لەم ڕووەوە بڕوانە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، دور الاکراد في ثورة العشرين العراقية. بغداد، ١٩٧٨.

٣- بۆ کورتکردنەوەی باسەکە بە پێویستم نەزانی باس لە میکانیزمی پەیوەندی نێوان بزووتنەوەی کورد و بزووتنەوەی فارس بکەم. چونکە بەگشتی تایبەتمەندییەکی ئەوتۆی نییە کە جیاوازی لەگەڵ میکانیزمی پەیوەندی نێوان بزووتنەوەی کورد و بزووتنەوەی نەتەوەیی تورک و عەرەبدا هەبێ، هەروا شۆڤێنیزمی بۆرژوازی فارس لە شۆڤێنیستی بۆرژوازی ئەم دوو نەتەوەیە کەمتر نییە.

### بەشی سێیەم

# هەڵوێستی حیزبە مارکسییەکانی ناوچەکە دەربارەی مەسەلەی کورد

مەسەلەی نەتەوەیی گەلی کورد یەکێکە لەو مەسەلە گرنگ و ئالۆزانەی لە مێژە رووبەرووی حیزبە مارکسییەکانی ئەو وڵاتانە بۆتەوە کە کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە.

هەندێ لەم حیزبانە (جگە لە حیزبی شیوعی سوری)، لە قۆناغی جۆربەجۆردا هەڵوێستێکی دیار و شۆرشگێرانەیان سەبارەت بە مەسەلەی کورد وەرگرتووە و، هەندێکیان، لە رابردوودا دانیان بە مافی بریاردانی چارەنووسی گەلی کورد لە وڵاتەکەیاندا، بە مافی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەییشەوە ناوە. هەروا سیاسەتی شۆڤێنیستانەی رژێمە دیکتاتۆرەکانیان ئاوانبارکردووە.

بەلاّم ئەگەر لەبەر رۆشنایی مەبدەئەکانی مارکسیزم- لینینزم سەبارەت بە نەتەوە ژێردەستەکان سەرنجی سەرجەمی بەرنامە و هەڵوێستی ئەم حیزبانە بەرامبەر بە مەسەلەی کورد بدەین ئەوا کۆمەڵێک ناتەواوی و هەڵە و پاشەکشە دەبینین.

ئەگەرچی کاتێ ئەم حیزبانە دامەزران تازە کوردستان دابەشکرابوو،

بەلام ئەوان تائێستا قەوارەی سیاسی وڵاتەکەی خۆیان وەک واقیعێکی نەگۆڕ و ئەبەدی وەرگرتووە. بەو چاوە بابەتییە سەیری قەوارەی دەوڵەتەکەی خۆیان ناکەن، کە بەشێک لە وڵاتی نەتەوەیەکی تری، بە زۆرەملی و دوور لە ویست و ئیرادەی خاوەنەکەی پێوە گرێدراوە. یان ئەم نەتەوەیەش، وەک نەتەوەکەی ئەوان، مافی ئەوەی هەیە لە هەمان وڵات و لە هەر بەشێکی کوردستاندا بە دەستی خۆی چارەنووسی خۆی دیاری بکات و دەوڵەتی خۆی دابمەزرێنێ و لەگەڵ بەشەکانی دیکەیدا یەکبگرێتەوە.

ئەم قەناعەتە فیکرییەی زۆربەی مارکسییەکانی نەتەوەی زاڵ وای لێکردوون بە حەماسێکی وەک حەماسی ناسیونالیستانی نەتەوەکەیان باسی یەکپارچەیی خاکی دەوڵەتەکەیان و مەترسی (ئینفصالییەت) و (تجزیە تەڵەبی) بکەن، کە ئەمەش لە جەوهەردا بێجگە لە نکۆڵیکردن لە مافی بڕیاردانی چارەنووسی نەتەوەی کورد و خۆ بە خاوەن زانینی نیشتمانەکەی شتێکی تر ناگەیەنێ. بەڕای من دەکرێ ئەم هەڵوێستەی مارکسییەکانی ئەو وڵاتانە بە زەقترین نیشانەی کارتێکردنی شۆڤینیزمی بورژوازی نەتەوەی گەورە بۆ سەر ئەم مارکسییەکانە دابنرێ. ئەم کارتێکردنەش لە وڵاتانی فرە نەتەوەدا شتێکی یەکجار چاوەڕوانکراو و ساماناکە. کاتێ خۆی مارکس زیرەکانە دەرکی بەم مەسەلەیە کرد و هەڵوێستی هەندێ لەهاوبیرە سۆسیالیستەکانی ئینگلستان بەرامبەر بە ئیرلەندا و لە سۆسیالیستە روسەکان بەرامبەر بە نەتەوەکانی روسیای بە خەوشی (یان خالای لاوازی) هاوبەشی نێوان ئەم سۆسیالیستانەی دوو نەتەوەی جۆربەجۆری زاڵ دادەنا. هەروا لینین بەردەوام داوای لە پرۆلیتارەکانی نەتەوەی زاڵ دەکرد کە

خۆیان لە شۆڤینیزمی بورژوازی نەتەوەکەیان رزگار بکەن.

هەروا دەکرێ ئەم هەڵوێستەی مارکسیەکانی ئەم وڵاتە سەبارەت بە مەسەلەی کورد وەک بەشێک لە لادانێکی فرەوانتر سەیر بکرێ کە لە سەردەمی ستالیندا سەرجەمی بزوتنەوەی کۆمۆنیستی جیهانی گرتوە. بە تایبەتی کاتێ ئەم حیزبانە دامەزران ستالینیزم لە هەرەتی برەو و گەشەکردنیدا بوو. بۆیە شتێکی چاوەڕوانکراوە کە ئەم حیزبە ساوایانە لە زۆر رووەوە، لەوانە پێناسەکردنی نەتەوە و هەڵوێست دەربارەی مەسەلەی نەتەوەیی و ناڕەوایی دامەزراندنی حیزبی کۆمۆنیستی لە وڵاتانی ژێردەست و پێداویستی ملکەچ بوونی تەواوی کرێکارانی چەوساوە بۆ کرێکارانی چەوسێنەر و...... هتد، کەوتبنە ژێر کارتێکردنی ستالین و ستالینیزمەوە.

لە سەرێکی دیکەشەوە بڵاوبوونەوەی بیری سۆسیالیزم و دواتر دامەزراندنی حیزبی مارکسی لەو وڵاتاندا زیاتر ئەنجامی پێداویستی خەباتی رزگاریخوازی وکارتێکردنی، شۆرشی ئۆکتۆبەر و بە جیهانی بوونی کولتوور بوو تائەوەی وەک وڵاتانی ئەورووپا، ئەنجامی گەشەکردنی چۆنایەتی و چەندایەتی چینی کرێکار و بزوتنەوەکەیان بووبێ. ئەم واقیعەش کەم تا زۆری کاری خۆی کردۆتە سەر خاسیەتی چینایەتی ئەم حیزبانە، کە هەندێ جار، بە تایبەتی لە وەرچەرخانە سەختەکاندا بە شێوەی جۆربەجۆر و زەق دەردەکەون.

گەڕانەوە بۆ سەرچاوە

رەنگە ئەم جۆرە باسانە، هەرنەبێ لە رووی میتۆدۆلۆژیەوە، ئەوە بخوازێ ئەگەر زۆر بە کورتیش بێ پەنجە بۆ هەندێ لایەنی جەوهەری و سەرەکی هەڵوێستی مارکسیزم- لینینزم سەبارەت بە مەسەلەی

نەتەوە چەوساوەکان درێژ بکرێ. بەپێی تیۆری مارکسیزم-لینینزم:(١)

١- هەموو نەتەوەکان، بە گەورە و بچووکیانەوە، مافی ئەوەیان هەیە خۆیان بڕیاری چارەنووسی خۆیان بدەن. مافی بڕیاردانی چارەنووسیش جگە لە مافی دامەزراندنی دەوڵەتی نەوەتەیی شتێکی تر ناگەیەنێ.

٢- بزوتنەوەی نەتەوە ژێردەستەکان ناوەڕۆکێکی دیموکراسییانەی هەیە چونکە دژی زوڵم و زۆر و ستەمە. جا لەبەر ئەوەی مارکسییەکان دوژمنی سەرسەختی هەموو جۆرە چەوسانەوەیەکن ئەوا لە هەموو کات و سەردەمێکدا دەبێ پشتگیری خەباتی نەتەوە چەوساوەکان بکەن.

٣- لە وڵاتانی فرە نەتەوەدا دەبێ مارکسییەکانی نەتەوەی زاڵ بەردەوام پڕوپاگەندە بۆ مافی بڕیاردانی چارەنووسی نەتەوە ژێردەستەکان و مافی جیابوونەوەیان بکەن. پشتکردنە ئەم ئەرکە، لەژێر هەر ناو و بەهانەیەکدابێ، تەنیا خزمەتی بورژوازی نەتەوەی زاڵ دەکات و بێجگە لە شۆڤینیزم شتێکی تر ناگەیەنێ.

٤- لە هەمان ئەم جۆرە وڵاتانەدا دەبێ مارکسییەکانی نەتەوەی ژێردەست پڕوپاگەندە بۆ برایەتی نەتەوەیی و یەکێتی ئارەزوومەندانەی نەتەوەکان بکەن.

٥- لەم جۆرە وڵاتانەدا، لە کاتێکدا مارکسییەکانی نەتەوەی گەورە دژی هەموو جۆرە ئیمتیازێکن کە نەتەوەی چەوسێنەر هەیەتی، بە توندیش بۆ نەهێشتنی ئەم ئیمتیازانە و بۆ یەکسانی تەواوی نێوان نەتەوەکان خەبات دەکەن. ئەم یەکسانی بوونەش بەبێ یەکسانی بوون

لە مافی دەمەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی مانایەکی نییە.

٦- پرولیتاریا لە کاتێکدا دان بەم یەکسانی بوونەی نەتەوەکاندا دەنێ و داکۆکی لێدەکات، ئەوا هاریەبانی نێوان پرولیتاری نەتەوەکان لە سەرووی هەموو ئیعتبارێکەوە دادەنێ. (دیارە ئەم هاریەبانییە لەسەر حیسابی مافی چارەنووس نییە و مەرجیش نییە ئەم هاریەبانییە تەنیا لەچوارچێوەی یەک حیزبی سەرتاسەری کە پرۆلیتاری نەتەوەی ژێردەست ملکەچی پرولیتاری نەتەوەی سەردەست بکات، بێتەدی).

٧- کاتێ کۆمەڵانی خەڵکی نەتەوەی چەوساوە، بەهۆی سەختی و دژواری چەوساندنەوەی نەتەوەییەوە ناتوانن لەگەڵ نەتەوەی چەوسێنەردا بژین و دەگەنە ئەو قەناعەتەی جیابینەوە، ئەوا ئەم جیابوونەوەیە لە بەرژەوەندی نەتەوەی ژێردەست و ئازادی خەباتی چینایەتی دایە.

٨- لە پاڵ ئەمانەدا لینین، لە تێزێکی تیۆری دیکەیدا سەبارەت بە مافی چارەنووس داوا لە پرولیتاریای نەتەوەی زاڵ دەکات کە خۆی لە شۆڤینیزمی بورژوازی نەتەوەکەی رزگاربکات و، لە رێگەی پێکەوە گرێدانی چارەنووسی بزوتنەوەی نەتەوەی ژێردەست بەو بزوتنەوەوە کە خۆی سەرکردایەتی دەکات نەتەوە چەوساوەکە رزگار بکات.

نازانم رووداوە و تاقیکردنەوەکان، لەوانە تاقیکردنەوەی وڵاتانی (سۆسیالیستی) تاچ ئەندازەیەک راستی و دروستی ئەم تێزەی دوایی لینینیان سەلماند، بەڵام پێموایە حیزبە مارکسییەکانی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان پێوە لکێندراوە، لە نێو سەرجەمی مەبدەئەکانی مارکسیزم- لینینیزم سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوە ژێردەستەکان زیاتر

ئاوریان لەم تێزەی لینین داوەتەوە بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم تێزە ماناى ملپێکەچکردنی بزوتنەوەی نەتەوەی ژێردەست بۆ بزوتنەوەی کرێکارانی نەتەوەی سەردەست دەگەیەنێ و لە مەبدەئەکانی تری مارکسیزم- لینینیزم دابڕاوە و بە دوور لە قۆناغە مێژوویيەکەی وەرگیراوە، ئەوا مەسەلەی مافی چارەنووسی نەتەوەی کورد و داکۆکی کردن لەم مافە بۆ قۆناغی سۆسیالیزم هەڵگیراوە یان لەژێر ناوی بەرژەوەندی کرێکاراندا بە جۆرێکی مرتلەق ملکەچی بەرژەوەندی نەتەوەی سەردەست کراوە کە دوایی باسی دەکەین. ئەمەیش لەناوەرۆکدا لەگەڵ مافی بڕیاردانی چارەنووسی نەتەوەکاندا ناکۆکە. بەڵام خۆ ئەمە تاکە ناکۆکییەک نییە کە لە مارکسیزم- لینینزمدا هەیە!! بە بەراوردێکی ئەم مەبدەئانەی مارکسیزم لەگەڵ هەڵوێستی حیزبە مارکسییەکانی ئەو وڵاتانە سەبارەت بە مەسەلەی کورد، بە ئاسانی، دەگەینە ئەم ئەنجامانە:

یەکەم: ئەم حیزبانە ئیمرۆ لە پرۆگرام و راپۆرتی پلێنۆمەکانی کۆمیتەی ناوەندییاندا بە چاوێکی بەرابەر و یەکسان سەیری نەتەوەی زاڵی ئەو وڵاتانە و نەتەوەی کورد ناکەن. بۆیە کۆمەڵێک راستی مێژوویيان فەرامۆش کردووە، لەوانە:

١- لەهەر یەکێک لەو وڵاتانەدا بەشێکی کوردستان هەیە و تەنیا نەتەوەی کورد ئەو کەمایەتییە نەتەوانەی تێیدا دەژین خاوەنی راستەقینەی ئەم نیشتمانەن.

٢- نەتەوەی کورد لە هەریەکێک لەو بەشانەی نیشتمانەکەیدا مافی ئەوەی هەیە، وەک نەتەوە زاڵەکە، بڕیاری چارەنووسی خۆی، بە

دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆشەوە، بدات و لەگەڵ بەشێک یان بەشەکانی دیکەیدا یەکبگرێتەوە.

٣- نەتەوەی کورد بزوتنەوەیەکی بابەتی مێژوویی هەیە بە تێوری بزوتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی کوردەوە، کە وەک هەر بزوتنەوەیەکی رزگاریخوازی لە ئەنجامی ناکۆکی نێوان کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان و دەسەڵاتی نەتەوەی چەوسێنەری بێگانەدا سەری هەڵداوە، بەو ئامانجەی ئەو ناکۆکییە نەهێڵێ و نەتەوەی کورد بە مافی بریاردانی چارەنووس بگەیەنێ.

٤- لەنێو ئەم حیزبانەدا، حیزبی شیوعی عێراق لە سەرەتادا هەڵوێستێکی ئاشکرای بەرامبەر مافی چارەنووسی نەتەوەی کورد لە عێراقدا، بە مافی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆشەوە، وەرگرتبوو،

بەلام ئەم هەڵوێستەی حیزب پاشەکشەی بە خۆوە دیوە، بە تایبەتی لەسەرەتای حەفتاکان بە دواوە، ئەوەتا ئەمرۆ مافی چارەنووس لە پرۆگرامی حیزبدا وەک شتێکی گشتی، نەک لە عێراقدا، هەروا وەک ئامانجێکی دوور باسکراوە و لە پراکتیکیشدا جیاوازی لە نێوان ئەمو هەڵوێستیحیزبە شۆڤێنیە عەرەبەکاندا نییە.

٥- رەنگە هەر لەبەر ئەمەش بێ حیزبی شیوعی عێراق لە کاتێکدا، لە هەموو دۆکیومێنتێکدا خۆی بە بەشێک لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی عەرەب لە سەرەتاسەری ولاتانی عەرەبیدا، دادەنێ و لە زۆر بواری عەرەبی و جیهانیشدا بەو شێوەیە رەفتار دەکات، کەچی لە هیچ دۆکیومێنتێکدا خۆی بە بەشێک لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی کورد، نە لە کوردستانی عێراق و نە لە سەرتاسەری کوردستاندا، دانانێ. لە کاتێکدا (بزوتنەوەی

کۆمۆنیستی عێراق لەو دووپارچەی عەرەبی و کوردستانی پێکهاتووە).[٢] کە واتا بۆ دەبێ کۆمۆنیستانی کوردستانی عێراق بەشێک بن لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەی عەرەب؟ ئایا ئەم بۆچوونە وەک ئەوە نییە بڵێین کۆمۆنیستانی بەسرا و عەمارە بەشێکن لە بزوتنەوەی کورد لە سەرتاسەری کوردستاندا!؟.

دووەم: ئەم حیزبە مارکسییانە لە کاتێکدا تیزە ناوبراوەکەی لینینیان (کە لە خاڵی هەشتەمی ئەم وتارەدا هاتووە) بە جۆرێکی دابڕاو لە مەبدەئەکانی تری مارکسیزم- لینینیزم- سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوە زۆر دەستەکان وەرگرتووە، پێم وایە لە ڕوانگەی تەسکی قەومییەوە لێکیان داوەتەوە بۆیە:

١- تەنیا لەیەک گۆشەوە سەرنجی چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردیان داوە، ئەویش هاتنە سەر حوکمی ئەم حیزبانەیە.

٢- مافی چارەنووسی نەتەوەی کورد، کە مافێکی ڕەوایە و لە هەموو قۆناخێکدا دەبێ مارکسییەکانی ئەم وڵاتانە داکۆکی لێ بکەن، لەبیر کرێکاران و کۆمەڵانی خەڵکی نەتەوەی گەورە براوەتەوە کەم تازۆر باسی لێوە ناکرێ و، بە جۆرێکی تەماوی سەیر بۆ قۆناخی سۆسیالیزم هەڵگیراوە. لە جیاتی ئەوە کۆمەڵانی خەڵکی نەتەوەی زاڵ بە تۆتۆنۆمی پەروەردە دەکرێن. کە ئەمە بێجگە لە خۆدزینەوە لە مافی چارەنووس و نکۆڵی کردن لەم مافە شتێکی تر ناگەیەنێ. چونکە لینین ڕەوایی مافی چارەنووس و داکۆکی لێکردنی و بگرە خەبات لە پێناوی ئەم مافەی بە قۆناخی سۆسیالیزمەوە نەدەبەستەوە. واتا ئەو مەرجەی دانەدەنا کە مافی چارەنووس دەبێ بۆ قۆناخی سۆسیالیزم هەڵبگیرێ.

پێموایە (حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان) لە زۆر کارتێکردنی هەمان لێکدانەوەی چەوت و باری تیژەکەی لیتیتدا نووسیویانە (مافی چارەی خۆ نووسین بۆ گەلی کورد لە دوای هێناتە سەرکاری حکومەتێکی کرێکاران و زەحمەتکێشان لە عێراقدا مەسەلەیەکی بێ چەند و چوون دەبێ).[٣] لێرەدا جێگەی ئەوە نییە کە باس لەوە بکەین ئەمڕۆ حیزبە کرێکارییەکان بە جیدی چاو بە مەسەلەی دەسەلاتی تاکە حیزبیدا دەگێرنەوە، یان کرێکارانی نەتەوەی زاڵ وەک دەرکەوت، کاتێ دەسەلاتدار دەبن دەتوانن شۆڤێنیستانە لەگەڵ نەتەوە ژێردەستەکانی وڵاتەکەیاندا رەفتار بکەن. بەلام لە هەموو ئەوانە دەپرسین کە ئەم مەرجە بۆ مافی بڕیارداتی چارەنووسی نەتەوەی کورد دادەنێن: بۆچی نەتەوەی کورد، لەچاو هەموو نەتەوە ژێردەستەکانی تری ئاسیا و ئەفریقیا، کە هەندێکیان ژێردەستەی دەوڵەتانی وەک پاکستان و خوارووی ئەفریقیا بوون، دەبێ چاوەڕوانی (حکومەتی کرێکاران و زەحمەتکێشانی) نەتەوەی زاڵ بکات؟ ئایا ئەم بۆچوونە ئەوە ناگەیەنێ (بیبوورن لەم لێکدانەوە سادەیە) داوا لە نەتەوەی کورد بکەین ئاوان بە خۆیدا بگرێ و بەرگەی لەناوبردنی بە کۆمەڵ و تواندنەوە و وێرانکردن و بە عەرەب کردنی نیشتمانەکەی بگرێ تا ئەو رۆژەی ئەم حکومەتە لە عێراقدا دێتە سەرکار؟ کەی مارکسیزم مەرجی دزێوی لەم بابەتە و شێوەی لەم چەشنەی بۆ مافی چارەنووسی نەتەوە ژێردەستەکان داناوە؟!.

٣- ئەم لێکدانەوە چەوتەی تیژەکەی لینین لەلایەن مارکسییەکانی ئەو وڵاتانەوە، لە پراکتیکدا بەوە شکاوەتەوە کە بزوتنەوەی کورد ناوەڕۆکە رزگاریخوازییەکەی لێدا داماڵدرێ و بکرێتە بەشێک لە

بزوتنەوەی دیمۆکراتی هەرکام لەو وڵاتانە.

جالەبەر ئەوەی هەرکام لەو بزوتنەواتە لەناوەرۆکدا بزوتنەوەیەکی بورژوازییە و هێزە ناسیۆنالیستەکانی نەتەوەی زاڵ رۆڵی سەرەکی تێدا دەبینن. هەروا بەو پێیەی بەرژەوەندی بەش بە جۆرێکی میکانیکییانە ملکەچی بەرژەوەندی گشت کراوە، ئەوا بزوتنەوەی کورد ملکەچی بزوتنەوەی ئەو نەتەوە زاڵانە کراوە. ئیتر بزوتنەوەی ئەو وڵاتانە دانی بە مافی چارەنووسی نەتەوەی کورددا ناوە یان نە؟! لە کاتی دەسەڵاتداریدا هەندێ لە مافە بنچینەییەکانی نەتەوەی کوردی داوە، یان شۆڤێنیستانە رەفتاری کردوە! ئەمەیان مەسەلەی سەرەکی نەبووە!!

لەوەش زیاتر هەندێ لەو حیزبانە کاتێ بۆخۆیان پشتگیری رژێمە بورژوازیەکانی وڵاتی خۆیان کردووە ئەوا فشاریان بۆ بزوتنەوەی کوردیش هێناوە تا پشتگیری ئەو رژێمە گوایا شۆرشگێر و پێشکەوتنخوازانە بکات. کاتێ هێزەکانی بزوتنەوەی کورد مافە بنچینەییەکانی گەلی کوردیان بە مەرجی ئەم هاوکارییە داناوە، ئەوا ئەم حیزبانە هەقیان بە خۆیان داوە دژی بزوتنەوەکە بوەستنەوە. وادەزانم لەم بۆچوونەوە بوو حیزبی شیوعی عێراق بەرامبەر بە شۆرشی ئەیلول توشی هەڵە هات. یان حیزبی تودە لە ساڵی ١٩٧٩دا هەر لە سەرەتاوە هەڵوێستێکی چەوتی بەرامبەر بە راپەرینی خەڵکی کوردستانی ئێران وەرگرت، کە دواتر فیداییانی خەڵکی ئێران (ئەکسەریەت) لە پروسەی نزیکبوونەوە و رووکردنەوە (وحدت) لەگەڵ حیزبی تودەدا پشتیان لە بزوتنەوەکە کرد و هەڵوێستی چەوتی تودەیان وەرگرت.

حیزبە مارکسیبەکانی ئەو ولاتانە لە هەندێ قۆناخدا بە شێوەیەکی زەق سەبارەت بە سروشتی گوایا پێشکەوتنخوازی رژێمە بورژوازیەکانی ولاتەکانیانەوە موبالەغەیان کردووە. هەرچەند ئەم رژێمانە درندانە لەگەڵ نەتەوەی کوردا جولاونەتەوە. لەوەش زیاتر ئەم حیزبانە لەبەر خاتری گوایا سروشتی دژ بە ئیمپریالیستی ئەو رژێمانە پەیوەندی سیاسی و ئابووریان لەگەڵ ولاتانی (سۆسیالیستی)دا، چاویان لە مەسەلە نێوخۆییە گرنگەکانی تری وەک دیموکراسی سیاسی و مافەکانی مرۆڤیش پۆشیوە.

تۆبڵێی ئەمە تەنیا ئەنجامی کارتێکردنی بورژوازی نەتەوەیی بێ؟ یان ئەنجامی کورتبینی تیۆری و تێنەگەیشتنی چەوتی پەیوەندی نێوان بەش و گشت بێ؟! کە بە هۆیەوە وەک چۆن مەسەلەی کورد کراوەتەوە بەشێک و مەلکەچی مەسەلەی دیموکراسی بورژوازی کراوە، بە هەمان شێوەش مەسەلەی دیموکراسی لەو ولاتانەدا کرابێتە بەشێک لەمەسەلەی کێشەی جیهانی نێوان سۆسیالیزم و ئیمپریالیزم و لەبەر خاتری ئەم شتە گشتییە قوربانی پێدرابێ؟!. یان ئەمە ئەنجامی پەیرەوکاری فیکری و سیاسی ئەم حیزبە مارکسییانە بووە، کە بۆتە هۆی ئەوەی بە چاوی خەڵکی دەرەوە سەیری رژێمە بورژوازییەکانی ولاتەکەیان بکەن و، زیاتر لە دید و بۆچوونەکانی ئەوانەوە، نەک بە پشتبەستن بە جەوهەر و ناوەرۆکی ئەم رژێمانە، هەڵوێستی خۆیان بەرامبەریان دیاری بکەن!! جا لەبەر ئەوەی ئەم خەڵکانەی و دەرەوە، وەک دەرکەوت، بەر لەهەمو شتێک لەبەر رۆشنایی بەرژەوەندی ئابووری و سیاسی خۆیاندا سەرنجی ئەم رژێمانەیان داوە، ئەوا بە لایانەوە گرنگ نەبووە کە ئەم رژێمانە لە نێو ولاتەکەی خۆیاندا چۆن

چۆنی لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵکیولەگەڵ نەتەوەی کورددا رەفتار دەکەن و تاچ ئەندازەیەک رێز لە مافەکانی مرۆڤ دەگرن. مەگەر خۆشیان بە جۆرێکی داپڵۆسێنەرانە دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ و مافی نەتەوە بچوکانی وڵاتەکەی خۆیان پێشێل نەکردووە؟! جا ئەگەر ئەوانی ئەوروپایی و گوایا نوێنەری چینی کرێکار بەم جۆرە لە نێو سنووری وڵاتەکەیاندا رەفتاریان کردبێ، بۆ دەبێ لایان سەیربێ کە رژێمێکی بورژوازی ئاسیایی هەمان ماف پێشێل بکات و تەنانەت نەتەوەیەکیش بە چەکی کیمیایی قڕ بکات؟!

بە کورتی ئەم حیزبە مارکسییانە پشتگیری مەلەسەی کوردییان کردووە و لە دژی سیاسەتی رژێمە دیکتاتۆرەکان وەستاونەتەوە، بەڵام بەرای من تارەرژکی هەڵوێستەکانیان زیاتر پەیوەندی بە تەبایی و ناتەبایی خۆیانەوە بووە لەگەڵ رژێمەکانی وڵاتەکانیاندا، واتا هەڵوێستی ئەوان لەناو جەرگەی خودی مەسەلەی کوردەوە هەڵنەقوڵاوە، بەڵکو زیاتر شتێکی تاکتیکی بووە. لەبەر ئەوە نەیانتوانیوە و ناشتوانن کارتێکردنێکی فیکری و سیاسی و جەماوەری ئەوتۆیان بۆسەر بزوتنەوەکە هەبێ.

لێرەدا پرسیارێک دێتە گۆڕێ: ئایا ئەم هەڵوێستەی حیزبە مارکسییەکانی بەرامبەر بزوتنەوەی کورد و خۆ نەکردنە خاوەنی مەسەلەی کورد هۆکارێک نییە، کە شانبەشانی هۆکارەکانی تر بزوتنەوەی کوردیان توشی شکستی جۆربەجۆر کردووە؟!

فەرامۆش کردنی مافی بڕیاردانی چارەنوسی نەتەوەی کورد بۆتە هۆی ئەوەی ئەمرۆ هیچ کام لەم حیزبانە دان بەوەدا نانێن کە نەتەوەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتەکەی ئەواندا مافی هەیە (هەرنەبێ رەک

ماڵ) دەوڵەتی خۆی دابمەزرێنێ. یان جۆرە فیدرالیەکی لەو چەشنەی هەبێ کە لە یەکێتی سۆڤیەتدا هەیە و ئەمڕۆ نەتەوەکانی ئەوێ پێی رازی نین؟! هاوڕێ عەزیز محەممەد تەنانەت ئەم جۆرە فیدرالیەش لە کوردستانی عێراقدا، بە یەکبوونی عەرەب (الوحدة العربية)ەوە دەبەستێتەوە(٤). ئایا ناکرێ ئەم بۆچوونەی هاوڕێ عەزیز بەو جۆرە لێک بدرێتەوە کە تکۆڵی کردنە لە مافی چارەنووسی نەتەوەی کورد لە عێراقدا؟! یان تکۆڵی کردنە لەوەی نەتەوەی کوردیش، وەک نەتەوەی عەرەب لە عێراقدا، مافی ئەوەی هەیە لەگەڵ بەشەکانی دیکەیدا یەکبگرێتەوە!!. لە کاتێکدا هاوڕێ فەهد، کە کوردستانی عێراقی بە هەرێمێکی ئەبەدی عێراق نەدەزانی، جەختی (تاکید)ی دەکرد کە گەلی کورد لە عێراقدا مافی هەیە ئازادانە بڕیار بدات کە ئاخۆ ئارەزوومەندانە لەگەڵ عێراقدا دەمێنێتەوە یان جیا دەبێتەوە. ئەو تەنانەت ئەم جیابوونەوەشی بە یەکبوونی عەرەبەوە نەدەبەستەوە بەڵکو پێش هەموو شتێک ملکەچی بەرژەوەندی گەلی کورد و جەماوەرە چەوساوەکەی دەکرد.

مارکسییەکانی ئەو وڵاتانە، کە لە ئۆتۆنۆمی زیاتر بە نەتەوەی کورد ڕەوا نابینن، باش دەزانن ئۆتۆنۆمی لە وڵاتێکی وەک یەکێتی سۆڤیەتدا، کە مەسەلەی نەتەوەیی بە نیوەچڵی تێدا چارەسەکراوە، زیاتر بەو نەتەوە بچووکانە دراوە کە لەسەر خاکی نەتەوەی تر دەژین. لەوەش زیاتر ئۆتۆنۆمی ئەوەندە شتێکی کەم نرخە تەنانەت ئەو کەمایەتییە موسڵمانەی کە بە نەتەوە گورجین، هەر لەبەر ئەوەی ئاینیان جیاوازە لە چوارچێوەی کۆماری فیدراڵی گورجستاندا ئۆتۆنۆمییان دراوەتێ و پەرلەمان و ئەنجومەنی وەزیرانی (نەک

ئەنجومەنی تەشریعی و تەنفیذی) خۆشیان هەیە. بەڵام ئەو نەتەوانەی نیشتمانی خۆیان هەیە ئەوا کۆماری فیدرالییان دامەزراندوە و حیزبی کۆمۆنیستی خۆشیان هەیە، هەرچەندە چوار لەو نەتەوە خاوەن کۆمارانە تەنیا لە سەدا یەکی دانیشتوانی سۆڤیەت پێک دێنن.

لێرەدا بەرای من بەرنامەی حیزبە مارکسییەکانی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان پێوە لکێندراوە دەربارەی مەسەلەی کورد بەرنامەیەکی مارکسییانە و ئینسانییانە نییە و، زیاتر لە بەرنامەی حزبێکی قەومی شۆڤینی نەتەوەی زاڵ دەچێ. هەر دەڵێی بەو نامالجە دارێژراوە کە لەلای ناسیونالیستانی نەتەوەی چەوسێنەر پەسندبێ. بۆیە بەرنامەیەکی شۆرشگێرانە نییە و لە ئۆتۆنۆمی زیاتر (کە شۆڤێنیترین تویژی بورژوازی عیراقیش دانی پێداناوە) بە نەتەوەی کورد رەوا نابینێ. ئۆتۆنۆمیش وەک لینین دەڵێ: ریفۆرمێکی ریفۆرمیستانە (اصلاحی)یە و ئیمتیازاتی نەتەوەی زاڵ و هەموو شێوەکانی چەوساندنەوەی نەتەوەیی لەناونابات، نەتەوەی خاوەن ئۆتۆنۆمی لەگەڵ نەتەوەی سەردار (الامه السیده)دا بەرامبەر نابێ.

کەچی ئۆتۆنۆمی لە نەتەوەی کورد لە عێراقدا کراوەتە دەرمانی هەموو دەردان و بە(دیارترین دروشمەکانی گەلی عێراق و بزوتنەوەی دیموکراسی و بزوتنەوەی کورد لە عێراقدا)دادەندرێ. بەڵام ئەم واقیعە سەپاوە لەبەر ئەوە نییە کە ئۆتۆنۆمی راسترین و رەواترین دروشمە بەڵکو بە رای من لەبەر ئەوەیە:

١- بزوتنەوەی کورد لاوازە و هێزی نەبووە، یان بوویەتی و باوەری بە خۆی نەبووە، داوای مافی زیاتر بکات.

٢-خەڵکی کوردستانی عێراق ئەو ئازادییەیان نەبووە بریاری خۆیان بدەن.

٣- بزوتنەوەی دیموکراسی عێراق، بە حیزبی شیوعیشەوە تائێستا لەوە زیاتری بەگەلی کورد رەوا نەدیوە.

ئەگەر دروشمی ئۆتۆنۆمی بەر لە ٣٥ ساڵێک، کاتێ دیموکراسی ترین هێزی عەرەب لە عێراقدا هیچ مافێکی نەتەوەیی بە گەلی کورد رەوا نەدەبینی، هەنگاوێک بووبێ بۆ پێشەوە کە وانییە، ئەوا ئەمڕۆ پێداگرتن لەسەر ئۆتۆنۆمی، کە درندەترین و شۆڤێنیترین توێژی بورژوازی عێراق دانی پێداناوە، دوو- سێ هەنگاوە بۆ دواوە. بە تایبەتی بۆ حیزبێکی مارکسی کە کەلەپوور (تراث)ێکی تیۆری و فیکری بە پێزی سەبارەت بە مەسەلەی کورد هەیە.

لێرەدا چەند پرسیارێک دێنەگۆڕ: کێ ئەم هەقەی بەم مارکسییانە و سەرجەمی بزوتنەوەی دیموکراسی ئەو وڵاتانە داوە تا لە جیاتی نەتەوەی کورد بریار بدەن؟!. ئایا کەس لە نەتەوەی کوردی پرسیوە کە ئاخۆ ئۆتۆنۆمی یان شتێکی تر دەخوازێ؟!. ئایا رۆژێک لە رۆژان نەتەوەی کورد ئەو ئازادییەی هەبووە کە پرسی پێیکرێ ئاخۆ دەیەوێ لە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتانەدا بمێنێتەوە یان نە؟!.

دراجار هێزەکانی نەتەوەی زاڵ هەر چییەک بن چەند خۆیان بە شۆڕشگێر بزانن و لەهەر وڵاتێکدابن ئەگەر تەماحیان لە خاک و ساماتی نەتەوەی ژێردەست نەکردووە و، ئەگەر نیشتمانەکەی بە موڵکی خۆیان نازانن بۆ تکۆڵی لە مافی چارەنووسی نەتەوەی ژێردەستی وڵاتەکەیان دەکەن؟!!.

هەڵوێستی حیزبە مارکسییەکان و هەڵوێستی سەرجەمی بزوتنەوەی دیموکراسی ئەو وڵاتانە متمانە و باوەڕپێکهوونی لە نێوان ئەم بزوتنەوانە و بزوتنەوەی کورددا لاواز کردوە. لە کاتێکدا

بەرژەوەندییەکانی خەباتی هاوبەش ئەوە دەخوازێ بە هێزترین پەیوەندی تێکۆشەرانە لەنێوان هەموو ئەم لایەنانە هەبێ. لەم رووەشەوە ئەرکی گەورەتر دەکەوێتە ئەستۆی هێزەکانی نەتەوەی گەورە بە تایبەتی مارکسییەکان، کە سەرباری ئەم ئەرکە، ئەرکی پاراستنی هاوپەیمانی نێوان کرێکارانی ئەم نەتەوانە و نەتەوەی کوردیشیان لە ئەستۆیە، چونکە بزووتنەوەی کورد چەند هەوڵ بدات بە تەنیا ناتوانێ ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەنێ بۆ ئەوەی ئەم باوەڕ پێکبوونەش بە تەواوی بێتەدی ئەوا پێویستە ئەم هێزانە چاو بە هەڵوێست و بەرنامەکانی خۆیاندا بگێڕنەوە و، بە ئاشکرا لە وڵاتەکەیاندا دان بە مافی چارەنووسی نەتەوەی کورد و مافی یەکسانبوونی لە دامەزراندنی دەوڵەتی خۆی و یەکبوونی نەتەوەییدا بنێن.

شتێکی نوێش نییە ئەگەر بڵێم مافی چارەنووسی نەتەوەکان وەک مەسەلەی دیموکراسی و مافی مرۆڤ بۆتە دیاردەیەکی شارستانی ئەم سەردەمە و نەک تەنیا هەر مارکسییەکان، بەڵکو هەموو ئەوانەی بە عەقڵێکی شارستانییانە بیردەکەنەوە و بە جۆرێکی ئینسانییانە سەیری مافەکانی مرۆڤ دەکەن دانی پێدا دەنێن و بە مافێکی ڕەوای هەموو نەتەوەیەکی دەزانن. تەنیا ئەوانەی لە شۆڤینیزم دەرباز نەبوون و کزیلەی (شارستانی) جەنگەڵ و بیرکردنەوەی کولتووری دواکەوتوانە و عەقلیەتی سەدەکانی ناوەراستن دەتوانن شەرم لەوە نەکەن کە تکۆڵی لە مافی چارەنووس و سەرجەمی مافەکانی مرۆڤ بکەن و نیشتمانی خەڵکی تر بە موڵکی خۆیان بزانن.

# سەرچاوە و پەراوێزەکان


١- بۆ پوختەی ئەم مەبدەئانەی مارکسیزم- لینینیزم پشت بەم سەرچاوانە بەستراوە: لینین؛ المختارات- المجلد الخامس- دار التقدم موسکو، ١٩٧٦. لینین تەواوی دانراوەکان، جلدی ٢٥ ,٢٦ سۆفیا ١٩٨١.

٣- حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستانی عێراق- لە چ ڕوانگەیەکەوە داوای پێکهێنانی پارتی پێشڕەوی کرێکارانی کوردستان دەکەین- .١٩٩ ل١٢.

٤- سەردەمی نوێ، ژمارە-٤٣- سێپتەمبەری ١٩٨٩ ل٩.

بەشی چوارەم

# تەنگوچەڵمەی فیکریی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان و ئاسۆیەکی روون

-١-

تەنگوچەڵمەی فیکریی بزوتنەوەی گەلی کوردستان وەک بەشێک لە تەنگوچەڵمەیەکی فراوانتر، لە باری دۆخی ئابووری و کۆمەلایەتی و کولتووری کوردستانەوە سەرچاوەی گرتووە. پرۆسەی داگیرکردن و ویرانکردنی سەدان ساڵەی کوردستان، وەک باسکرا، سەرجەمی ژیانی مادی و رۆحی نەتەوەکەمانی شێواندو، دەرفەتێکی لەباری بۆ گەشەکردنی شێوازەکانی بەرهەمهێنان و دەرکەوتن و پێگەیشتنی سروشتیانەی توێژ و چینی نوێی کۆمەلایەتی نەهێشتەوە.

کوردستانی خواروو کە ئەم تەنگوچەڵمە فیکرییەی تێدا دەرکەوت، لە سەردەمی بابانەکانرا سەرەتای بوژانەوەیەکی نوێی ئابووری و سیاسی و کولتووری بە خۆیەوە دی، بەلام هەر زوو هێرش و پەلاماری عوسمانییەکان و ئێرانییەکان و شەری نێوخۆی بابانەکان ویرانیان کرد .

رووداوەکانی یەکەمین جەنگی جیهانی و هێرشی لەشکری بەریتانیا

بۆ سەر کوردستانی خواروو و ڕووخاندنی حوکمداری شێخ مەحموود کارەساتێکی سامناکی ئابووری و کۆمەڵایەتییان ئایەوە. هەروا کاتێ ئەم بەشەی کوردستان بە عێراقەوە گرێ درا، بە درێژایی دەیان ساڵ هیچ جۆرە پرۆژەیەکی گرنگی ئابووری، پیشەسازی، کولتووری و ئاوەدانکردنەوەی بەخۆیەوە نەدی، بە پێچەوانەوە، وەک هەر وڵاتێکی داگیرکراو، بەسەدان سەربازگەو پۆلیسخانە و بنکەی تری عەسکەری گەمارۆ درا.[1] تەواوی ئەم هۆکارانە و تاڵان کردن و دادزشینی ئابووری کوردستان، ڕێگەی پێشکەوتنی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارییان بڕی و بووتە هاندەری بابەتی مانەوەی پەیوەندییەکانی فیوداڵی و داب و نەریت و ترادیسیۆنی عەشیرەتگەری لە کوردستانی خوارووودا. لەوەش زیاتر کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا دەیویست ئەم پەیوەندی و داب و نەریتانە زیاتر بچەسپێنێ. بۆ ئەم کارەیش پێگەی ئابووری و سیاسی ئەو سەرۆک هۆز و فیوداڵانەی خیانەتیان لە بزووتنەوەی کورد کردبوو بەهێز دەکرد و بەمەیش بەرژەوەندی چینایەتییان زیاتر بە کۆلۆنیالیزم و ڕژێمی کۆنەپەرستی عێراقەوە دەبەسترایەوە.

بەم جۆرە دوای ڕزگاربوونی عێراق لە کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا، کۆمەڵگای کوردستان هێشتا کۆمەڵگایەکی فیوداڵی بوو . هێشتا وەک دکتۆر ڕەشاد میران دەڵێ ( یاسا و پەیوەندییەکانی خێڵەکی و دەرەبەگایەتی تیادا زاڵ بوون کە ستریوتیپی چەسپاوی خۆیان هەبوو و ڕەگەکانیان لە ناو کوردەواریدا قووڵ داکوتراوبوون و لە جۆری بیرکردنەوە و هەڵسوکەوت و زمان و ترادیسیا و هەروەها لە ڕێبازی خەباتی نەتەوەییشدا ڕەنگی خۆیان دابووەوە ).[2]

لەم بارو دۆخە ئاڵۆزە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەدا بوو کە تەنگوچەڵەمەی فیکری بزووتنەوەی کورد، وەک بەشێکی گرنگ لە تەنگوچەڵەمەی هێزە کۆمەڵایەتییەکانی نێو بزوتنەوەکە و سەرکردایەتییەکەی بە زەقی دەرکەوت. هەروا وەک هەر دیاردەیەکی فیکری کاری خۆی کردەسەر دەوروبەرە بابەتییەکەی. چونکە هەر دیاردەیەکی فیکری تەنیا بەرهەم، یان رەنگدانەوەی دەوروبەر نییە، بەڵکو هۆکارێکی کاریگەریشە بۆ کارکردنە سەر دەوروبەر. بۆیە ناکرێ و بگرە هەڵەیە کە چارەسەرکردنی ئەم تەنگوچەڵەمە فیکرییە، بەگۆڕینی بارو دۆخی بابەتی کوردستانەوە، یان بە جۆرێکی ئۆتۆماتیکییانە بە چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەکانی تری بزوتنەوەکە گرێ بدرێ. چونکە ئەم جۆرە بۆچوونانە لە قاڵبدانی فیکرە، یان نکوڵی کردنە لەو رۆڵە کاریگەرەی کە فیکر، بەهۆی سەربەخۆییە نیسبییەکەیەوە، لە گۆڕینی دەوروبەردا دەیگێڕێ.

لەم بۆچوونەوە، لام وایە، تەنگوچەڵەمەی فیکریی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان لەیەک کاتدا ئەنجام و هۆکارە. واتا ئەنجامی تەنگوچەڵەمەیەکی بابەتییانەیە و لە هەمان کاتدا هۆکارێکیشە یارمەتی مانەوەو بگرە ئاڵۆز بوونی تەنگوچەڵەمە بابەتییەکە دەدات.

لەم روانگەوە هەوڵدەدەم باسی ئەم تەنگوچەڵەمە فیکرییە بکەم.

( ٢ )

تەنگوچەڵەمەی فیکری بزووتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی کوردستان لەو ناکۆکییەدایە کە لە نێوان ناوەرۆک و ئامانجی مێژوویی بزووتنەوەکەو لەنێوان بەرنامە و ئامانجی لایەنە خۆییەکەیدا هەیە. بە واتایەکی دی ئەو ئامانجەی هێزەکانی نێو بزووتنەوەکە خەباتی بۆ

دەکەن لەگەڵ ئاوەڕۆک و سروشتی بزووتنەوەکەدا ناتەبا و ناکۆکن و بگرە کۆسپێکی خۆیی راستەقینەن لەبەر دەم گەشە کردنی بابەتییانەیدا. چونکە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان، وەک هەر بزووتنەوەیەکی رزگاریخوازی، بەو ئامانجە مێژووییە دەرکەوتووە تا ناکۆکی نێوان کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان و دەسەڵاتی چەوسێنەری بێگانە چارەسەر بکات. واتا بەهانەی مێژوویی سەرهەڵدان و مانەوەی بزووتنەوەکە لەو سروشت و ناوەڕۆکە رزگاریخوازییەبدایە کە نەتەوەی کورد بە مافی بڕیاردانی چارەنووس و نیشتمانە دەگیر کراوو ( الحاق ) کراوەکەی بەسەربەخۆیی بگەیەنێ .

بەڵام کاتێک بزووتنەوەیەکی رزگاریخوازی لەم ڕێباز و ئامانجە مێژووییەی خۆی وەردەچەرخێندرێ و ، ڕووەو ئامانجێکی لاوەکی چەواشە دەکرێ ئەوا ئەم بزووتنەوەیە سروشت و ناوەڕۆکە رزگاریخوازییەکەی لێدا دەماڵرێ، یان دەشێوێندرێ، یان بە سروشت و ئامانجە مێژووییەکەی خۆی و بە خواستی کۆمەڵانی خەڵکەکەی نامۆ دەکرێ. دەشێ ئەم پرۆسەیە، لەبەر هەر هۆکارێکی نێو خۆیی یان دەرەکی بێ، بەسەرەتای تەنگرچەڵەمەی فیکری، دواتریش سیاسیی بزووتنەوەکە دابندرێ.

ئاشکرایە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان لەسەرەتای سەرهەڵدانییەوە تا نیوەی دووەمی ئەم سەدەیە بۆ رزگاری و سەربەخۆیی کوردستان خەباتی دەکرد. تا ئەو کاتە هەموو خەبات و راپەڕین و شۆڕشەکانی نەتەوەی کورد بۆ خۆ رزگارکردن و سەربەخۆیی کوردستان بوو. بەڵام دوای زنجیرەیەک تێکشکان و نسکۆ و دوای لە دەست دانی چەندان هەل و دەرفەتی مێژوویی کە ڕووداوەکانی هەردوو جەنگی

جیهانی ڕەخساندیانن[٢] هەروا لە سایەی بارو دۆخێکی تێوخۆیی پڕ لە تێشکانی ڕۆحی و دەورەکی پڕ لە کێشەی زلهێزەکاندا مەسەلەی ڕزگارکردنی کوردستان، وەک ئامانجی هێزەکانی نێو بزووتنەوەکە، جێگای بۆ ئۆتۆنۆمی چۆڵکرد. بەمەیش هەموو ڕەنج و خەباتی نەتەوەی کورد ئاراستەی ئەم ڕێبازە چەوتە یان تراویلکە ( سەرابی ) ئۆتۆنۆمی کرا. لێرەوە لام وایە قۆناغێکی چۆنایەتی سەرجەم نوێ لە تەنگرەچەڵمەی فیکری ـ سیاسی بزووتنەوەی گەلی کوردستان دەست پێدەکات کە تا ئەمڕۆ بەردەوامە. چونکە لەو کاتەوە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد ( کە ئەو کاتە مەڵبەندەکەی کوردستانی عێراق بوو ) کەسایەتی و سەربەخۆیی خۆی لەدەست داو سروشت و ناوەرۆک و ئامانجە ڕزگاریخوازییەکەی لێداماڵرا و کرایە بەشێک لە بزووتنەوەی دیموکراسیی بۆرژوازی عێراق و دواتریش ئێران، کە لە بنەڕەتدا ئامانجیان گۆڕینی ڕژێمی سیاسی ئەم وڵاتانە، یان چەسپاندنی دیموکراسی بۆرژوازییە، نەک ڕزگارکردنی مرۆڤ و خاکەکەی لە دەسەڵاتی چەوسێنەری بێگانە.

ئەم پرۆسەیە، یان ئەم وەرچەرخانە فیکرییە ـ سیاسییە بزوتنەوەکەی بەخۆی و بە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان، یان بە خواست و ئامانجەکانیان نامۆکردو، بزوتنەوەکەی رایێچی تەنگرەچەڵمەیەکی فیکری ـ سیاسی ئەوتۆ کرد کە ئاسان نییە و بگرە مەحاڵە بەبێ گەڕانەوەی بۆ سەر ڕێباز و سروشت و ئامانجە ڕزگاریخوازییەکەی لێی دەرباز ببێ.

ئەگەر ئۆتۆنۆمی ، وەک دروشم و ئامانجی بزووتنەوەی کورد بەرهەمی، یان ئەنجامی فیکریی لاوازی و تێشکان و تەنگوچەڵمەی

هێزەکانی نێو بزووتنەوەکە و سەرکردایەتییەکەی بێ، ئەوا پێدا گرتن و بەردەوام بوون لەسەر ئەم ئامانجە، هۆکاری فیکریی ئاڵۆز بوون و قووڵ بوونەوەی تەنگوچەڵەمەکە و کێشەکانە نوێیەکانییەتی. بەم مانایە دروشم و ئامانجی ئۆتۆنۆمی لەیەک کاتدا ئەنجام و هۆکارە، واتا ئەنجامی فیکریی تەنگوچەڵەمە و کێشەکانی بزووتنەوەکەیە، لە هەمان کاتدا هۆکاری فیکری قووڵبوونەوەی تەنگوچەڵەمەکانی بزوتنەوەکە و کێشەکانیەتی.

لەم بۆچوونەوە بەرای من دەشێ هەردوو هەرەسەکەی ساڵانی ١٩٧٥ و ١٩٨٨ کە لە بنچینەدا کێشەکانییەتی فیکری بوون و لە شێوەی هەرەسی سیاسی و عەسکەریدا دەرکەوتن، وەک ئەنجامێکی حەتمی ئەم تەنگوچەڵەمە فیکرییە سەیر بکەین.

دروشمی ئۆتۆنۆمی لە کوردستانی خواروو دا بۆ یەکەم جار حزبی شیوعی عێراق لە بارو دۆخێکدا کە هەردوو نیشتمانەکەی دەوڵەتی عێراقی لێدا ئاشراوە لە ژێر دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزمی بەریتانیادا بوون، بەرزی کردەوە، واتا خودی ئەم دروشمە لە دەرەوەی بزوتنەوەی کورد ڕا هات. بەڵام سەرکردایەتی ئەوکاتەی بزووتنەوەی کورد، کە کۆمەڵێک لاوی خوێندەواری کەم تەجروبە بوون و دەرەتانێکی ئەوتۆی سیاسی و جەماوەرییان نەبوو، ئەم دروشمەی حزبی شیوعیان بە خێرو بەرەکەتێکی مەزن دانا، بە تایبەتی کە هیچ کام لە حزبە عێراقییەکانی ئەو سەردەمە باوەڕیان بە کەمترین مافەکانی گەلی کورد نە دەهێنا.

هەڵبەت ئەگەر زەمینەی بابەتی نێو کۆمەڵگای کوردستان لەبار نەبوایە و ئەگەر بۆرژوازی کورد لە ڕووی ئابوورییەوە لاواز و لە ڕووی سیاسییەوە پەراگەند نەبوایە، ئەوا هێندە بە ئاسانی پشتی لە ئامانجە

مێژوویەکەی خۆی نەدەکرد، خۆی بە بۆرژوازی عەرەبی عێراق و بزووتنەوەی کوردیشی بە بزووتنەوەی دیموکراسی بۆرژوازی عێراقەوە هەڵنەدەپسارد تا دوای سەربەخۆیی عێراق لە سایەی رەحمەتی ئەودا هەندێ خێرو بەرەکەت بە خۆیی و نەتەوەی کورد ببڕێ.

دوای شۆڕشی ١٤ ی تەمووزی ١٩٥٨ گەلی عەرەبی عێراق بە تەواوی لە کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا دەرباز بوو و سەربەخۆیی سیاسی وەدەست هێنا، بەڵام گەلی کوردستانی عێراق هەر بە ژێر دەستەیی مایەوە و ، تەنیا کۆت و پێوەندەکەی، بان جۆری دەسەڵاتە بێگانە چەوسێنەرەکەی گۆڕدرا. چونکە دەسەڵاتی بۆرژوازی عەرەب بە جۆرێکی ئۆتۆماتیکییانە جێگای دەسەڵاتی کۆلۆنیالی بەریتانیای گرتەوە و بگرە بە جۆرێکی زۆر درندانەتر درێژەی بە ( الحاق ) و داگیرکردنی کوردستان دا، کوردستانی بە عێراقەوە لکاو میراتێکی دزراوو ناشەرعی کۆلۆنیالیزمی بەریتانیایە کە بۆ بۆرژوازی عەرەبی عێراق ماوەتەوە. ئەوانەی نکوڵی لەم راستییە مێژوویە دەکەن، بە مارکسییەکانی عێراقیشەوە، ئەوا بیانەوێ و نەیانەوێ لە ڕووی یاسایی و سیاسی و ئەخلاقییەوە پاکانە بۆ بۆرژوازی عێراق و رەفتارە رەگەزپەرستەکانی بەرامبەر بە کورد دەکەن.

لەبەر چاو نەگرتنی ئەو راستییە بابەتییەی کە کۆمەڵگای کوردستان، دوای تەمووزی ١٩٥٨ هەر بە کۆمەڵگایەکی رزگاریخوازی نیشتمانی مایەوە و، سەربەخۆیی سیاسیی عێراق تەنیا سەربەخۆیی سیاسی بەشە عەرەبییەکەی عێراق بوو نەک کوردستان، لەبەرچاونەگرتنی ئەم راستییە تەنگوچەڵەمەی فیکریی بزوتنەوەی کوردی لە تەنگوچەڵەمەیەکی تیۆری – فیکرییەوە گۆڕی بە تەنگوچەڵەمەیەکی پراکتیکی –

سیاسی. له ئەنجامدا سەرجەمی بزووتنەوەی کورد، کە بە درێژایی چواردە ساڵ، لە راپەڕین، یان ( شۆڕش )ی ئەیلولدا بەرجەستە بوو، لە ئەلقەیەکی داخراودا دەسووڕایەوە. چونکە بزووتنەوەیەک بوو لە پێناوی هەندێ داخوازی ریفۆرمیستانە ( اصلاحي ) نەک بۆ رزگار کردنی خاک و مرۆڤ. ئەمیش یەکەمجار بوو لە مێژووی تۆیدا کە کورد بۆ (ئۆتۆنۆمی) نەک بۆ رزگاری کوردستان خەبات، یان شۆڕش بکات!!

ئەم رێبازەش چەوتترین و دزێوترین شوێنەواری ( شۆڕشی ) ئەیلوولە کە بەسەر بزووتنەوەی نەتەوەکەمان لە کوردستانی عێراق و دواتریش لە کوردستانی ئێراندا سەپێندرا.

بۆیە بەرای من ئەگەر راپەڕینی ئەیلول و راپەڕینەکەی ئەم دواییەی کوردستانی عێراق بەم ئەنجامە تراژیدیەش نەگەیشتبان ئەوا مەحاڵ بوو بتوانن دەسکەوتێکی چۆنایەتی نوێ بۆ گەلی کورد بێننە دی. لەوەش زیاتر ئەگەر نەک دوو ( شۆڕش ) بەڵکو ئەگەر چەند شۆڕشیش لە کوردستانی عێراق یان ئێران و تورکیادا بۆ ئۆتۆنۆمی بکەین، ئەوا جگەلە بە فیڕۆدانی باشترین وزەی فیکری و فیزیکی نەتەوەکەمان و بەوێرانکردنی ولاتەکەمان شتێکی باشتر لەوەی هەیە وەدەست ناهێنین. چونکە بزووتنەوەی رزگاریخوازی و ئامانجی ئۆتۆنۆمی وەک ئەوە وایە چاوەڕێ لە دابەروێنێک و دوو ئۆکسجین، خورما، یا سەمەنی، نەک ئار دروست بکەین.

بە هەر حاڵ ئەو رێبازەی بەهۆی شانۆ شکۆی شۆڕشی ئەیلولەوە بەسەر بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستاندا سەپێندرا، کۆتایی بەو قۆناخە مێژووییە دوور و درێژە و بەو خەباتە رزگاریخوازییە هێنا کە نەتەوەی کورد لە کوردستانی خواروو دا لەسەردەمی باباندکانەوە تا

شۆڕشەکەی شێخ مەحموودی نەمر و دواتریش بۆ ڕزگار بوون و سەربەخۆیی کوردستان دەستی پێکرد بوو. لە جێگەیدا خەبات و (شۆڕش) بۆ ئۆتۆنۆمی بوو بە پیشەی نەتەوەی کورد و بزووتنەوەکەی. هەر لەم ڕێگەیەشەوە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان کە ئامانجی ڕزگارکردنی خاک و مەزرەکانی کوردستان لە دەسەڵاتی چەوسێنەری بێگانە لە داێک بووە، بە تەواوی و تا ئیمڕۆ کرایە بزووتنەوەیەکی ریفۆرمیستی و بەشێکی کەم ترخی بزووتنەوەی دیموکراسیی عێراق کە هەمیشە لە پێناوی ئەمدا قوربانی پێدەدری، هەروا سەرجەمی ئاواتی گەلی کورد لە چوار چێوەی ئۆتۆنۆمی و دواتریش لە چوارچێوەی جۆری ئۆتۆنۆمییەکە دا (ئەمڕۆ ڕاستەقینە و سبەینێ ڕاستەقینەتر!!) تەنگەبەرکرا. لەکاتێکدا مافی ئۆتۆنۆمی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی هێندەی زەوی و ئاسمان لە یەکترەوە دوورن. هەر بۆیە لە دونیادا بزووتنەوەیەکی تری ڕزگاریخوازی نیشتمانی نادۆزرێتەوە خەبات و شۆڕش بۆ ئۆتۆنۆمی بکات. بگرە نەتەوەیەکی تری ژێر دەستەو خاوەن نیشتمان نادۆزرێتەوە ( مەگەر لە ئێران! ) کە ئۆتۆنۆمی بە تەوەین و سوکایەتی نەتەوەیی نەزانێ!! ئەوە هەر ئێمەین لەبەر باوەڕ بەخۆ نەبوونمان و لە ترسی شۆڤێنیزمی هێزە چەپەکانی عێراق و ئێران دەستبەرداری ئامانجی سەربەخۆیی نیشتمانەکەمان بووین و شوێن سەرابی ئۆتۆنۆمییەک کەوتووین کە ئاوێزین لای ( دۆستەکانیشمان! ) سنووره جوگرافییەکەی دیاری بکەین.

هێزە ئۆپۆزیسیۆن و چەپەکانی ئیمڕۆی عێراق و ئێران بۆ وەدەست هێنانی دیموکراسی و دەوڵەتی قانون خەبات دەکەن. تا لە سایەیدا ئازادییەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، سەربەستی فیکر و بیروڕا دەربڕین

و ڕێکخستن و هەڵبژاردن بۆ خەڵکی ئەم دوو وڵاتە دەستەبەر بکرێن.

بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەم هێزانە لە کاتێکدا دیموکراسییەکی بێ سنوور بۆ نەتەوەو وڵاتەکانیان داوا دەکەن، کەچی کە دەگەنە بەردەم مەسەلەی گەلی کوردستان، دیموکراسییەکەیان، کە هێشتا هەر قسەی سەرکاغەزە، تەنگەبەر دەکەنەوە و لە ئۆتۆنۆمی ( خودموختاری ) زیاتر بە نەتەوەی کورد ڕەوا نابینن! ئەمەش بە تەواوی پێچەوانەی دیموکراسی و ئازادی و یەکسانی و مافی گەلانە.

بەرای من ئەو دیموکراسییەی ئەم هێزانە دەیانەوێ دوا ڕۆژ لە وڵاتەکانیاندا بیچەسپێنن بە دیموکراسییەکی گێرو ئیفلیج، بە دیموکراسییەکی دراکەوتووانە و ساختە دەمێنێتەوە ئەگەر لە سایەیدا مافی بڕیاردانی چارەنووس، بە مانەوە لەگەڵ ئەم وڵاتانە یان بە جیابوونەوە، بۆ نەتەوەی کورد دەستەبەر نەکرێ.

ئەم جۆرە دیموکراسییە لە ناوەرۆکدا (دیموکراسی) هێزە شۆڤێنیستەکانە. ئەوان لەوبەری زەبوونی دان کەچی لەوە دەترسن سنوورە وەهمییەکانی دەوڵەتەکانیان درزی تێ بکەوێ. بەڵام ئەگەر ئەم سنوورانە بۆ ئەوان پیرۆز و ڕەوایە ئەوا نەتەوەی کورد تەنیا کاتێک (ئەو سنوورانەی لا پیرۆز و ڕەوا دەبێ، سنووری نیشتمانەکەی ئەوی تیا کۆبکرێتەوە و مافی بڕیاردانی چارەنووسی ئەوی تیا زەوت نەکرێ. ئەگینا ئەو چوارچێوەو سنوورانە بۆ کورد هەر زیندانە و جگەلەم مافەش هەر هەستکارێکی ( پشتیوانی کردن ) هەر هێندەی لە دەست دێت، دەلاقەیەک بۆ کورد بخاتە زیندانەکەوە.(٤)

بە کورتی ئەوە دیموکراسی ئاخر زەمانە کاتێ هەموو جۆرە مافێک بۆ ئەو گەلە سەردەستانە بە ڕەوا بزانێ، کەچی ئۆتۆنۆمی بکاتە

شمشێرەکەی ( دیمۆکلیس )ی بە تاڵە مووێک بەسەرسەری گەلی کورد دا هەڵیواسیوە.

**-٣-**

ئەگەر تەنگوچەڵەمەی فیکریی بزووتنەوەی گەلی کوردستان لە ناکۆکیی نێوان سروشت و ناوەرۆکی رزگاریخوازانەی بزووتنەوەکەو نێوان بەرنامە و ئامانجەکانی لایەنە خۆییەکەیدا کۆببێتەوە، ئەوا هەوڵێن هەنگاوێکی فیکری بۆ دەرباز بوون لەم تەنگوچەڵەمەیە دەبێ بە چارەسەرکردنی ئەم ناکۆکییە نێو خۆییەی بزووتنەوەکە دەست پێبکات. واتا دەبێ ئامانج و ڕێبازی ئیمڕۆی لایەنە خۆییەکەی بزووتنەوەکە لەگەڵ ناوەرۆک و سروشت و ئامانجی مێژوویی رزگاریخوازانەی بزووتنەوەکە ئاشنا ( یان ئاشت ) بکرێتەوە.

خەبات و ئامانجی ئیمڕۆی نەتەوەی کورد و هێزەکانی نێو بزووتنەوەکەی لەهەر بەشێکی کوردستاندا، بۆ مافی بڕیاردانی چارەنووس بێ، نەک بۆ ئۆتۆنۆمی. لە پرۆسەی چارەسەرکردنی ئەم ناکۆکییە – تەنگوچەڵەمەیەدا دەشێ گۆڕانێکی چۆنایەتی بەسەر بزووتنەوەکە و مەسەلەی گەلی کوردستاندا بێ‌و هێزی نوێی کۆمەڵایەتی – سیاسی رۆڵی سەرەکی لەم خەباتە رزگاریخوازییەدا ببینن. کە لە ئەنجامدا:

١- بەرنامەو ئامانجی بزووتنەوەی گەلی کوردستان، جارێکی‌تر دە بێتەوە بە بەرنامە و ئامانجێکی رزگاریخوازانەی نیشتمانی، کەلە ناوەرۆکدا گەیاندنی نەتەوەی کوردە بە مافی بڕیاردانی چارەنووسی نەتەوەیی و نیشتمانی خۆی. بەمەیش ئەو ئەفسانە پوچەڵە دوایی دێت کە گوایا بزووتنەوەی کورد بەشێکە لە بزووتنەوەی دیموکراسی ئێراق و

ئێران و تورکیا و سوریا. بە پشت بەستن بەم بنەما فیکرییە دەشێ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان بەرنامەیەکی ڕزگاریخوازانەی نوێ دابڕێژێ کە مەسەلەی ڕزگار کردنی مرۆڤی کورد و نیشتمانەکەی بکاتە ئامانجی سەرەکی خۆی.

هەروا بەرژەوەندی ڕزگاری نیشتمانی لەسەرووی بەرژەوەندی هەموو هێزو چین و حیزب و دەوڵەت و زلهێز و لایەنێکی‌تر بگرێ.

٢- مەسەلەی گەلی کوردستان لەسەر بەشێکیدا. لەوە زیاتر بەمەسەلەیەکی نێو خۆیی ئەو وڵاتانە نامێنێتەوە کە کوردستانیان پێوە لکێندراوە. بەڵکو دەبێتەوە مەسەلەی وڵاتێک کە داگیر و ( الحاق ) کراوە، مەسەلەی نەتەوەیەک کە کۆیلە کراوەو دووچاری لەناوبردنی بەکۆمەڵ هاتووە، نەتەوەیەک کە نیشتمان و زمان و کولتوور و داب و نەریت و مێژووی تایبەتی خۆی هەیە و بە پێی هەر یاسا و لۆژیک و دەستوورێکی ئینسانی و جیهانی مافی ئەوەی هەیە خۆی چارەنووسی نەتەوەیی و نیشتمانی خۆی دیاری بکات.

مەسەلەی کورد هەر لە پەیماننامەی سیڤەر را بە شێوەیەکی یاسایی بوو بە مەسەلەیەکی نێو دەوڵەتان. بەڵام ئامانج و داخوازی تۆتۆتۆمی کە خۆمان پێی ڕازی بووین، مەسەلەی ئێمەی لە مەسەلەی نەتەوە و وڵاتێکەوە کردە مەسەلەیەکی نێو خۆیی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، ئەمەش چەکێکی یاسایی ( قانونی ) بەو دەولەتانە داوە تا وەک مەسەلەیەکی نێو خۆیی ڕەفتار لەگەڵ نەتەوەی کورد بکەن و لەناوی بەرن.

٣- مافی بڕیاردانی چارەنووس و سەربەخۆیی نیشتمانی ئامانجێکی ڕوون و ئاشکرایە بۆیە بە پێچەوانەی ئۆتۆنۆمی، دەرفەتی سازشکاری

ئاڕەوا نادات و سنوورێک بۆ ئەو سەرداو ماملە هەرزان بەهایە دادەنێ کە تا ئێستا بە مەسەلەی نەتەوەکەمانەوە دەکرێ.

لە بارو دۆخی ئیمرۆی جیهاندا کە سنوورە ( پیرۆزەکان ) و دیوارە ئایدیۆلۆژییەکان، لەبەر پێی نەتەوە دابەشکراوەکاندا هەرەس دێنن، مەسەلەی مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەلان، وەک مەسەلەی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ بۆتە ڕاستییەکی جیهانی و بگرە ڕەختە بیبێتە پێوەرێک بۆ دیاریکردنی ئاستی شارستانی و پلەی دیموکراسیی دەوڵەتان. ئا لەم کاتەدا دەرفەتێکی جیهانی لەبار ڕەخساوە تا مەسەلەی نەتەوەکەمان وەک مەسەلەی وڵاتێکی دابەشکراو... وەک مەسەلەی ئازادی نەتەوەیەکی کۆیلەکراو... وەک مەسەلەی ٢٥ ملیۆن مرۆڤ کە دەیانەوێ خۆیان چارەنووسی شەخسی و نەتەوەیی خۆیان بڕیار بدەن بخرێتە بەردەم ڕای گشتی جیهان و سازمانی نەتەوە یەکگرتووەکان و، هەموو هێزو لایەن و کەسە نیشتمانپەروەرەکان، بەیەک دەنگ و یەک ئیرادەوە وەک یەکەمین هەنگاو، داوا بکەن تا ڕاگیری گشتی ( ریفراندۆم )لە کوردستاندا و لە ژێر چاودێری نەتەوەیەکگرتووەکاندا بکرێ بۆ ئەوەی نەتەوەی کورد چارەنووسی خۆی، بە مانەوە لەگەڵ ئەم دەوڵەتانە، یان بە جیا بوونەوە بڕیاربدات.

بەکورتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان هەر لە سەرەتا ڕا بە ئامانجی ڕزگار کردنی خاک و مرۆڤە ژێر دەستەکانی کوردستان دەرکەوتووە. ئەوکاتەیش دەتوانێ بوون و ئەرکی مێژوویی خۆی بسەلمێنێ و سەرکەوتن وەدەست بێنێ کە بۆ هەمان ئامانجی مێژوویی خۆی درێژە بە خەبات بدات. وەرچەرخاندنی بزوتنەوەی کورد لەم ئامانجە مێژووییەی خۆی ناوەرۆک و سروشت و ئایدیۆلۆژیاکەی

شێواندووە. لە ئەنجامدا خەبات و قوربانیدانی دەیان ساڵەی نەتەوەکەمان بە فیڕۆ دراوە. لەوەش زیاتر مەسەلەی ڕەوای نەتەوەکەمان لە مەسەلەی نەتەوە و وڵاتێکی ژێر دەستە و دابەشکراو ڕا کراوەتە مەسەلەیەکی نێوخۆیی هەرکام لەم دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان. ئەمەیش تراژیدیایەکی نەتەوەییە دەبێ لێی دەرباز بین. دەشێ چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەی فیکریی بزوتنەوەی کورد هەوڵێن هەنگاوێنک بێ بەم ڕێگایە سەختەدا.

لە پرۆسەی ئەم گۆڕانکارییە فیکرییەدا، دەشێ بزووتنەوەکە لەهەر بەشێکی کوردستاندا ، بەرنامەیەکی ڕزگاریخوازانەی ئەوتۆ دابڕێژێ کە فراوانترین خەڵکەکانی کوردستان، لەسەر بنچینەی دیموکراسییەکی نوێی دوور لە کلێشە و قاڵبە حیزبایەتییە باوەکان لە دەوروەی ئەم بەرنامەیە کۆبێتەوە. چونکە مەسەلەی ئازاد کردنی خاک و مرۆ لە ژێردەستی و کۆیلایەتی هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە بەرژەوەندی و ئایندەیان و مان و نەمانیان بە سەربەخۆیی و ڕزگاربوونەوە بەستراوە. مەگەر دەسەڵاتی شۆڤێنیست و ڕەگەزپەرستی بێگانە، لە هەربەشێکی کوردستاندا، مەترسی تواندنەوەو لەناو بردنی فیزیکی و ڕۆحی بۆ سەر هەموو لایەک و بۆسەر تەواوی بوونی نەتەوەییمان نییە!!.

دواجار… ئەگەر وەرچەرخاندن و چەواشەکردنی بزوتنەوەی کورد ڕووبەڕوو تۆتۆتۆمی تا ئێستا هەڵەیەکی مێژوویی بوو بێ، ئەوا لەمەودوا هەڵەیەکە لە ئاستی تاواندایە!

# سەرچاوەو پەراویزەکان

١- بە پێی ئەو زانیارییەی مامۆستا محمد ئەمین زەکی لە نامیلکەی ( محاسبەی نیابەت )دا بڵاوی کردۆتەوە، لە ساڵی ١٩٢٥ تا ساڵی ١٩٢٨ هەمووی پەسەریەکەوە تەنیا (٣٦ ) هەزار روپی ( روپیە ) بۆ کردنەوەی قوتابخانە لە سلێمانی و ناوچەکانیدا خەرج کراوە. کەچی بەرامبەر بەو پارە کەمە ( ٨٤٥ ) هەزار روپی بۆ دروستکردنی قشڵە و سەراکانی ( پۆلیس ) سلێمانی و قەرەداغ و پێنجوین و ناوچەکانی تری سلێمانی خەرج کراوە. بڕوانە: د. کمال مەزهەر ئەحمەد، مێژوو ـ کورتە باسێکی مێژوو و کورد و مێژوو، بەغدا ١٩٨٣ ل ١٥٥.

٢- د . رەشاد میران، مێژوو چییە و مێژووی کورد چۆن دەبێ. گۆڤاری (یەکگرتن ) ژمارە/١١ بەهاری ١٩٩٠ ل ١٦- ١٧.

٣- بزووتنەوە هەڵ و دەرفەتی داتەپینی ئیمپراتۆری عوسمانی کە دەوڵەتانی رۆژهەڵاتی عەرەب دوای ئەوە دامەزران، پەیماننامەی سیڤەر . هەروا تێشکانی شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی نەمر و رووخاندنی حوکمداری کوردستان، شۆڕشەکەی شەهید شێخ سەعیدی نەمر، رووخاندنی کۆماری دیموکراتی کوردستان لە مەهاباد بە سەرۆکایەتی پێشەوای شەهید قازی نەمر.

٤- هاشم کۆچانی، سەرەتایەک دەربارەی کێشەی نەتەوایەتی_مافی چارەنووس، فیدراڵی، ئۆتۆنۆمی، سەردەمی نوێ ژمارە ( ٥٣ ) ١٩٩٠.

## ئەنجام:

نەتەوەی کورد ڕووبەڕووی دووڕیانێکی مێژوویی بۆتەوە: یان ڕاپەڕین بۆ سەربەخۆیی، یان مانەوە بە ژێردەستی.

ئەگەرچی نەتەوەکەمان لە مێژە ڕێگای یەکەمیان هەڵبژاردووە، قوربانییەکی بێ ئەندازەی بۆ ڕزگاربوون داوە بەڵام جێگای پرسیار و ڕامانە کە تائێستا بە بچووکترین ئامانجەکانی خۆی نەگەیشتووە! تا ئێستا لە هەرەسێکەوە بۆ هەرەسێک لە تراژیدیایەکەوە بۆ تراژیدیایەک ڕاپێچ دەکرێ؟!

ئایا هۆکارە دەرەکییەکان و ڕۆڵی زلهێزەکان و شوێنی جیوپۆلیتیکی کوردستان بەرپرسیاری ئەم تراژیدیایەن؟ یان هۆکارە سەرەکییەکان بۆ بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی و فیکری و سیاسی و کولتووری نێو خودی کۆمەڵگای کوردستان دەگەڕێتەوە؟!. ئەم پرسیارانە و چەندانی تر، کە پەیوەندییان بە چارەنووسی نەتەوەکەمانەوە هەیە، بۆ ئەوە دەشێن بیرکردنەوەی ڕووناکبیرانی کورد داگیر بکەن.

باسەکانی نێو ئەم کتێبە وەڵامی پرسیارەکانی سەرەوە نادەنەوە، بەڵکو لە بنەڕەتدا بەو ئامانجە نووسراون کە خوێنەری کورد بۆ پرسین

و پشکنین هان بدەن. بەو هیوایەی لە پرۆسەی پشکنین و پرسینی گومانکارانەدا لەناعەتە چەوتەکانمان، کە بەرهەمی تەمبەڵی فیکریی و فەناتیزمی حیزبایەتی و گومڕایی ئایدیۆلۆژی و سیاسین، درز بێنن تا بتوانین هەقیقەتێکی نوێ، کە هەقیقەتی مەسەلەی ئازادی نەتەوە و سەربەخۆیی نیشتمانەکەمانە بەدی بکەین و لەسەرڕووی هەر مەسەلەیەکی ترەوەی بگرین.

دواجار خۆم بە بەختەوەر دەزانم ئەگە باسەکانی نێو ئەم کتێبە بچووکترین ئامانجێکی خۆیان وەدەست هێنابێ.

# سەرچاوەکان


١- العقيد الركن احمد الزيدي، البناء المعنوي للقوات المسلحه العراقيه، بيروت، ط١، ١٩٩٠.

٢- ادونيس ـ الثابت و المتحول، بحث في الاتباع و الابداع عند العرب، الجزء الاول، طبعه ثالثه منقحه، دار العوده، بيروت ١٩٨٠.

٣- ئەنوەر قادر محەممەد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، ستوکهۆلم ١٩٩٠.

٤- پیرەمێرد، یاداشتەکانی پیرەمێرد. ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا، رۆژنامەی ئاسۆ، بەغدا، ژمارە ( ٤٨ ) رۆژی ٢٣/٦/١٩٩٠.

٥- د. پێری شالیار ـ بڵاوکراوەی ( کوردستان الیوم ) العدد ٤ و ٥ کانون الثاني ـ شباط ١٩٨٩.

٦- د. حسين مروه، النزعات الماديه في الفلسفه العربيه الاسلاميه دار الفارابي، بيروت ١٩٧٩.

٧- رەشاد میران، مێژوو چیه و مێژووکرد چۆن دەبێ، گۆڤاری ( یەکگرتن ) ژمارە ( ١١ ) بەهاری ١٩٩٠.

٨- رەفیق سابیر، گەشەکردنی بیری نەتەوەیی و سەرەتاکانی بیری سۆسیالیستی لە کوردستانی خواروو دا، گۆڤاری ( رێگای ئاشتی و سۆسیالیزم ) ژمارە ( ١٥ ) ١٩٨٨.

٩- شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە هەژار کردوویە بە کوردی، چاپی دووەم تاران ١٩٨١.

١٠- د. عبدالرحمن قاسملو، کوردستان و کورد، وەرگێڕ عبدالله حسن زادە، ١٩٧٣.
١١- عبدالقادر ابن رستم بابانی، تاریخ و جغرافیای کردستان موسوم بە سیر الاکراد، بکوشش محمد رئوف توکلی، چاپخانەی ارژنگ ١٣٦٦.
١٢- علاءالدین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەغدا ١٩٥٢.
١٣- عەلی میر فەتروس، ئیسلام ناسی، سیامەک بابەک کردوویە بە کوردی، ١٩٨٧.
١٤- د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ، چەند سەرنجێک دەربارەی زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی، بەغدا ١٩٧١.
١٥- د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ، احمدی خانی شاعیرا و مفکرا، فیلسوفا و متصوفا، بغداد ١٩٧٩.
١٦- طبری، برخی بررسیها درباره جیهان بینی‌ها و جنبشهای اجتماعی در ایران، چاپ دووم ١٣٦١.
١٧- قالح عبدالجبار، الحرکات السیاسیە الاسلامیە في مصر، (ندوە شارک فیها صلاح عیسی و آخرون) گۆڤاری (النهج) العدد ١٩٨٩/٢٥.
١٨- ف.ا.لینین، تەواوی دائراوەکان، جلد ٢٥ و ٢٦ بە زمانی بولگاری، سوفیا ١٩٨١.
١٩- ف.ا.لینین، المختارات ـ المجلد الخامس، دار التقدم ـ موسکو ١٩٧٦.
٢٠- د. کمال مەزهەر ئەحمەد مێژوو کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو، بەغدا ١٩٨٣.

٢١- د. كمال مەزهەر ئەحمەد دور الاكراد في ثوره العشرين العراقيه بغداد ١٩٧٨.
٢٢- محمد امين زكي خلاصه تاريخ الكرد و كردستان ترجمه محمد علي عوني الطبعه الثالثه ١٩٦١.
٢٣- میلان کزندرا، زوڵمی مێژوو نەتەوەیەکی بچووک. رۆژنامەی ( کزمار ) ژمارە ( ١ ) سوید خەزەڵوەری ١٩٩٠.
٢٤- هاشم کزچانی، سەرەتایەک دەربارەی کێشەی نەتەوایەتی، مافی چارەنووس، فیدرالی، ئۆتۆنۆمی، رۆژنامەی ( سەردەمی نوێ ) ژمارە ( ٥٣ ) ١٩٩٠.
٢٥- هیوا، زنار تەنگوچەڵەمەی بزوتنەوەی نیشتمانی کورد و کام جێگرا ١٩٩٠.

